چاپی دووەم

# ١١١١




# ئامۆژگاری زێرین

## بۆ نەوە سەرکردەکان


ئامادەکردنی

**عمر محمود فقێ**



٢٠١٥ز - ١٤٣٦ک


کتێبێک لە هەموو بوارێکەوە بۆ هەموو ئاستێک


www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي






ناسنامەی کتێب

نـــاو : ( ١١١١ ) ئامۆژگاری زێڕین بۆ نەوە سەرکردەکان .

بابەت : گەشەپێدانی مرۆیی .

نووسینی : عمر محمود فقێ

نەخشەساز : سرود مصطفی

چاپخانە : چاپخانەی رۆژهەڵات

چـــاپ : دووەم چاپ

تیراژ: ( ٢٠٠٠ ) دانە .

نرخی کتێب : ( ٣٥٠٠ ) دیناری عێراقی .





کتێبخانەی

حاجی قادری کۆیی

دیزاین - چاپکردن - بڵاوکردنەوە

٠٦٦ ٢٢٢٣٨٦٨

٠٦٦ ٢٦٤٨٩٠٧

عێراق - کوردستان - هەولێر



مافی چاپ پارێزراوە





mdmaktaba@gmail.com



لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٥٩٠ ) ی ساڵی ( ٢٠١٤ ) ی پێدراوە


بۆ هەر تێبینی و پێشنیارێک راستەوخۆ پەیوەندی بکە بە پەیجی نووسەر لەسەر تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیس


بووک بە ناونیشانی : Omer Chooser 

ژ . مۆبایل : 0750 705 2232

## پێناسەی کتێب ...

**بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان ، دوای سلاّو و ڕێزم ...**

**بەخۆشحاڵیەوە ماوەیەکی باشم تەرخانکرد بۆ یەك بەیەکی کۆکردنەوەی وتەکان و و زیاد و کەم کردنی هەندێکیان و گوڵ بژێرکردنیان لە ڕۆژگاری ژیانم بۆ ئەوەی وەك شکارێك بتوانم بیرۆکەکانم ڕاوبکەم و سودیان لێ وەربگرم و بیانکەم بە ئەزموون بۆ ئەوەی ئەمرۆ و دوا ڕۆژم ، وە بەتواناو سەلیقەیەکی گەنجانەوە دەستم کردوە بە کۆکردنەوەی بابەتەکان ، ئەگەرچی ئێستا لەم ستایلە لە بازاڕو لەژێر ناونیشانی جۆراوجۆردا چەندین کتێب و نامیلکە بە قەبارەو دیزانی جیاجیا دەکەونە بەرچاو بەلاّم ئەوەی لەم کتێبەی بەردەستی بەڕێزتان وەك جیاوازی بەدیدەکرێت سەرەڕای هەمەڕەنگی بابەتەکان چەند گوتەیەکی بلاّونەکراوەشی لە خۆگرتووە کە بەشێکیان هی خودی نووسەرە ، لەگەڵ ئەوەی جیاواز لەوانی تر لە ئامادەکردنی ئەم کتێبەدا زۆر گرنگیم بە کەسەکان و خاوەن گوتەو گوتەزاکان نەداوە هێندەی کارم لەسەرخودی بابەتەکەدا کردووە ، ئەوەش بەو مانایە نایەت کە گوتەکان لە خاوەنەکانیان ون بکەم ! بەڵکو مانا گرینگەکەی لەوەدایە کە ئێمە بتوانین پەیڕەوی وتەو وشەو پەیڤە جوانەکان بکەین بەدەر لەوەی کە کێ وتویەتی و لەکوێ وتراوە ، ئیتر بە هیوای ئەوەم ئەمە سەرەتای دەستپێکی بەرهەمەکانم بێت و دوا کتێبیش نەبێت کەتۆی خوێنەر دەیخوێنیتەوە چونکە خوێندنەوە سەرچاوەی ڕۆشنبیری مرۆڤ و کرانەوەی ژیریەتی ، جا ئەم پەندو ئامۆژگاریانەش کە لە دوتوێی ئەم کتابەدان زادەی هەوڵ و ئەزموونی خەڵکانێکن کە دەگونجی من و تۆی خوێنەر لێیان وردبینەوەو وەك سەرچاوەیەك بۆ ڕوانینمان ڕوەو داهاتوویەکی گەشتر سودی لێ وەربگرین ، چونکە مەبەستم لە ئەوەی سەرکردە لەم کتێبەدا سەرکردەی ڕامیاری و سەربازی نین بەڵکو مەبەستمان سەرکردایەتی خودی نەفسە کە مرۆڤ بتوانێ سەرکردەیەکی نمونەیی نەفسە خراپەکانی بێت و لەهەمان کاتیشدا دیلی ویژدانی بێت ، هەروەها مەبەستمان ئەم جۆرە سەرکردانەن کە کۆنترۆڵی خۆیان دەکەن پێش خەڵکانی تر وە کۆنترۆڵی عەقلەکان دەکەن پێش جەستەکان ، بۆیە زۆر لە مێژە گوتراوە مرۆڤی ژیر لە ڕێگەی ئەلفێکەوە دەگات بە پیتی یا ، جا لە خودای میهرەبان داواکارم بتوانم ببم بە پەیژەیەك بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەم تا بگەن بە لوتکەی زانیاری و نمونەی سەرکردایەتی و ە بگەن بەو جیهانە جیاوازەی کە چاوەڕوانیانە .**

# کـۆتـــایی !!!

بەناوی خودای بەخشندە و میهرەبان ...

خوێنەری بەرێز لات سەیر نەبێت کە ئەم کتێبەی نێو دەستت جیاوازە بە چەند خاڵێکی نایاب لە کتێبەکانی تر، کۆتایی ئەم کتێبەمان کرد بە سەرەتا هەروەك سەرەتای ئەم کتێبەشمان کرد بە کۆتایی تاکو خوێنەر پێش ئەوەی دەست بە خوێندنەوەی ئامۆژگاریەکانی ناو کتێبەکە بکات پێویستە گشت بیرکردنەوە نێگەتیڤەکانی وەلانێ و کۆتاییان پێ بهێنێت بەمە دەتوانێ زیاتر سوود لە خوێندنەوەی یەك یەکی ئامۆژگاریەکان وەرگرێت ، واتە ئەو کۆتاییەی کە ئێمە کردوومانە بە سەرەتا ئاوێنەی خەیاڵەکانتە کە پێویستە کۆتایی پێ بێت و پاشان دەست بە خوێندنەوەی کتێبەکە بکەیت ئەمەش بۆ ئەوەیە کاتێ کتێبەکەت بە ووردی خوێندەوە و کۆتاییت بە یەکەیەکەی ئامۆژگاریەکانی هێنا هەست دەکەیت زۆر کار هەبووە لە ژیانت بە هەڵە مامەڵەت لەگەڵ کردووە ، لە کۆتاییش دا دەبینی لە شوێن لاپەڕەی کـــــۆتایی نووســـراوە ﴿ سەرەتا ﴾ ئەمەش بۆ ئەوەیە خوێنەر هەست بەوە بکات لەگەڵ کۆتایی پێ هێنانی کتێبەکە پێویستە ژیانێکی نوێ و سەرەتا دەست پێبکاتەوە بە جێ بەجێ کردنی ئەم ئامۆژگاریە زێڕینانەی کە گشت لایەنەکانی ﴿ ئاینی و گەشەپێدانی مرۆیی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و رۆشەنبیری و زانستی و ... هتد ﴾ لە خۆگرتووە ، وە بەشی سەرەکی کتێبەکەمان لە ئامۆژگاریەکانی خودای مەزن و خۆشەویستەکەیی و کەسانی زانا و دانا و بلیمەت کۆ کراونەتەوە و بەشەکەی تریشی لە لایەن نووسەرەوە نووسراوە و دەستکاری کراوە ، ئەوەی گرینگە باسی بکەم ئەمەیە کە ناوی هیچ کەسایەتیەکمان نە نووسیوەتەوە بۆ ئەوەی ئەوکاتەی لە خوێندنەوەی ناوی کەسایەتیەکان بەسەر دەبەیت با ئەم کاتە لە خوێندنەوەی وتەکانیان و ئامۆژگاریەکانیان بەسەر بەریت بۆیە هیوادارم سوود لە هەموو پیتێك و وشەیەك و خاڵێکیش وەرگرن چونکە ئەم کتێبە کۆکراوەی سەدان عەقڵە لە عەقڵێکی نوێ دا .




## ﴿ ئامۆژگاریە زێرینەکان بۆ نەوە سەرکردەکان ﴾

١. بۆ ئەوەی هەنگاوی سەرەتایی بوون بە سەرکردە بنێیت ، تا دەتوانی بۆ ئاخاوتن زمانی جەستە بەکار بهێنە .

٢. گرینگ نیە ئامۆژگاری و زانیاریەکی زۆرت پێ بێت ، گرینگ ئەوەیە تێگەیشتنت لێیانەوە دروست بێت .

٣. باشترین ڕێگا بۆ ئامۆژگـــاری کەســـــانی دەوروبەرت بریتیە لە ڕەوشـــتت .

٤. ئایە دەزانی ئاین ئامۆژگاریە هەروەك خـــۆشـــەویست سێ جـــار فەرمووی :- ﴿ الدين النصيحة ﴾ بۆیە هەرکەسێك ئامۆژگاری ئەمڕۆ بەخۆڕایی نەکڕێت ، بێگومان بەیانی پەشیمانی بە دوو هێندە دەکڕێت .

٥. هەرچەند لە ژیان فێری زانست بیت ئەوەندە ترس دەخەیتە دڵی دوژمنەکانت ، وە هەرچەند زیاتر بزانیت و بخوێنیت ئەوەندە کەمتر دەترسیت .

٦. ئەگەر بینیت گشتی خەڵك لە بەرامبەرتدا وەستاون و دژایەتیت دەکەن و تۆش بە تەنیایت ئەوا تەنها رووت وەرگێڕە و پشتیان تێکە دەبیت بە سەرکردەیان و دەبن بە سەرباز بۆت .

٧. هەوڵدە ئاستی ووشەکانت بەرزکەیتەوە نەك دەنگت چونکە ئەوەی گوڵەکان گەشە پێ دەکات بارانە نەك هەورە تریشقە .

٨. نەکەیت لە خۆبایی بیت چونکە لە خۆبایی بوون پێش ئەوەی باڵ بە مرۆڤ بدات بفڕێت قاچەکانی دەشکێنێت .

٩. پێت دەڵێن ئەگەر گوڵ نیت دڕکیش مەبە ، تۆش پێیان بڵێ ﴿ دڕك هەر چەند بە ئازاروو بە ئێشە بەڵام هەرگیز ئازاری گوڵ نادات ، بەڵکو ئازاری ئەو کەسە دەدات کە ئازاری گوڵ دەدات ﴾ .

١٠. خوشکی بەڕێز پێڵاوەکانت بەرز مەکەوە بۆ ئەوەی باڵات بەرز بێت ، ڕەوشتت بەرزکەوە بۆ ئەوەی سەرت بەرز بێت ، وە حیجاب بپۆشن و خۆتان داپۆشن پێش ئەوەی بە کفن داتان بپۆشن .

١١. لە ژیاندا خۆت بە هیچ کەسێك پەیوەست مەکە تەنانەت سێبەرەکەشت ، چونکە کاتێ دەگەیتە تاریکی وازت لێ دێنێت .

١٢. هەرگیز حەز لە یاسای شەترەنج مەکە چونکە لەوێ سەربازەکان لە ناو دەچن تەنها بۆ ئەوەی پاشا زیندوو بێت بۆیە بە دڵنیاییەوە لە کۆتایی یاریەکەدا گشت سەرباز و پاشاکان بۆ هەمان سندوق دەگەڕێنەوە .

١٣. زۆر بە خانەدانی و بنەماڵەت هەڵمەدە و مەنازە چونکە هەرکەس بە کردەوەکانی دواکەوێت بەرەچەڵەك پێش ناکەوێت .

١٤. ئێمەی میللەتی کورد پێویستیمان بە ژووری خەوتن نیە بەڵکو پێویستیمان بە ژووری هەستانەوەیە لە خەو .



١٥. هیچ هەڵەیەکی بچووك بەکەم مەزانە چونکە رووبەرووی شکستی گەورەت دەکاتەوە ، بۆیە جارێکیان لە جەنگ بەهۆی بزمارێك ناڵێك کەوت ، بەهۆی ناڵێك ئەسپێك کەوت ، بەهۆی ئەسپێك سوارێك کەوت ، بەهۆی سوارێك جەنگێك دۆڕا بەهۆی دۆڕانێك وولاتێك شکستی هێنا و وێران بوو ئەمە دەرئەنجامی فەرامۆشکردنی هەڵەی بچووکە !!!

١٦. شکستی مرۆڤ مانای کەوتنی نیە ، بەڵکو شکست ئەوەیە ئەگەر کەوتی هەڵنەستیتەوە .

١٧. هەوڵدە ناوە ناوە وەسیەتنامە یەك بۆ منداڵەکانت و خێزانەکەت بنووسیت کە چیت هەیە و چیت نیە ، وە لای ئەو کەسە دانێ کە متمانەت پێیەتی بەتایبەتیش کاتی سەفەر .

١٨. ئەگەر پێویستیت بە ئارامی و ئاسودەیی بوو ، برۆ منداڵێکی بچووك یان پیرێکی بەساڵاچوو بدوێنە چونکە هی یەکەم دونیا ناناسێ و هی دووەمیش خەریکە ماڵئاوایی لێدەکات بەمە دەتوانی ژیان بناسیت پێش ڕاستی ڕاستگۆکانی .

١٩. چۆن ئەشێت ئاسمان ببێت بە سنوور بۆ حەزەکانمان لە کاتێکدا شوێن پێی مرۆڤ گەیشتۆتە سەر مانگ .

٢٠. هەرکات ویستت شۆڕشێك تێك بشکێنیت تەنها ڕەهەندی تایفی و ئاینی پێ ببەخشە ئیتر خۆی دەبێت بە تۆز و خۆڵ .

٢١. شەهید بە شێوازی مردنی خۆی ، شێوەی ژیان فێری نەتەوەکەی دەکات .

٢٢. هەروەك جۆرێك لە شێتی لەناو عیشق دا هەیە هەمیشە جۆرێك لە ژیریش لەناو شێتی دا هەیە .

٢٣. بەختەوەری وەك یاری تۆپی پێ وایە ، کاتێك لێمان دوورە بەدوای دەکەوین کاتێکیش پێی دەگەین شەقی تێ هەڵدەدەین دواتریش گلەیی دەکەین لەوەی بۆچی ناگەین بە بەختەوەری .

٢٤. هەوڵدە لەکاتی چاوپێکەوتن لەگەڵ کەسێك دا بە خەندەووە تەوقەی لەگەڵ دا بکەیت و بەچاوانت سەیری چاوانی بکەیت و دەستی کەمێك بگوشیت چونکە لەکاتی تەوقەکردنی دوو موسوڵمان گوناهەکانیان هەڵدەوەرێ هەروەك گەڵای دار لە پایزدا هەڵدەوەرێ .

٢٥. کەم زانین و زۆر ووتن وەك نەبوونی و زۆر خەرج کردنە .

٢٦.ماڵەکەت جێ مەهێڵە بەبێ بوونی ئامێری ئاگر کوژێنەوە ، بەکارهێنانی ئامێرەکەش فێری کەسانی ماڵەوەت بکە .

٢٧. هیچ بڕیارێك لە کاتی تورەبووندا مەدە و هیچ بەڵێنێکیش لەکاتی خۆشیدا مەدە .

٢٨. مرۆڤێکی ئازابە گەر ئازاش نیت خۆت بە ئازا دەرخە چونکە زۆر کەس جیاوازی پێ ناکات .

٢٩. فێربە چۆن گوێ لە کەسانی بەرامبەرت دەگریت جا چ بچووك بێت چ گەورە چونکە گوێگری باش قسەکەرێکی باشی لێ بەرهەم دێت .



۳۰. کەس بێ هیوا مەکە لە ژیان چونکە لەوانەیە ئەمە گشت سەروەتیان بێت ، وە هیواکانت کورت کەوە ماوەی کارکردنت زیاد دەبێت چونکە گەورەترین ( بکوژ ) بکوژی هیواکانن وە خراپترین راوێژکاریش بۆ مرۆڤ حەزەکانن .

۳۱. کاتێ کەست نەدۆزیەوە بۆئەوەی گوێت لێ بگرێت دەست بە قەڵەم بگرە و ئامۆژگاریەك بنووسەوە چونکە ئەوسات کاغەزەکە دەبێت بە وەکیل و گوێ لە قەڵەمەکەت دەگرێت .

۳۲. بە مەرجێك بێ دەنگیت دەبێت بە ئاڵتوون کە نەگات بە ئاستی لاڵ بوون ، وە ئەگەر کەسێك خۆی لە ڕەوانبێژی قسەکردندا بەسەر تۆدا سەلماند تۆش بە ڕەوانبێژی لە بێ دەنگی دا خۆت بەسەر ئەودا بسەلمێنە چونکە چینێك لە کەسان هەن تەنها زووبانی بێ دەنگی تێدەگەن ، هەر لەبەر ئەمەشە قورسترین زانست لە زانستی قسەکردندا ﴿ بێ دەنگیە ﴾ ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کاتێ قسەیەك دەکەیت دەیان لێکدانەوە بۆ قسەکانت دەکەن بەڵام کاتێ بێ دەنگ دەبیت سەدان لێکدانەوەت بۆ دەکەن .

٣٣. گوێ لە هەموو کەسێ بگرە و لە هەموو کەسێکەوە فێربە چونکە کەس هەموو شتێك نازانێت بەلاّم هەموو کەسێك شتێك دەزانێت .

٣٤. تۆ تەنها لەوە بەرپرسیارنیت کە دەیڵێیت بەڵکو لەوەش بەر پرسیاریت کە نایڵێیت کاتێ کە دەبوایە بیڵێیت .

٣٥. منالّەکات تەنها فێری خوێندنەوە مەکە بەڵکو فێری ئەوەیان بکە ئەوەی دەیخوێننەوە بیخەنە ژێر پرسیار و گفتووگۆوە .

٣٦. خۆزگە ئەوەندەی داواکاری هەیە لەسەر فۆتۆشۆپ بۆ جوانکردنی رووخسارەکان ، نیو ئەوەندە داواکاری دەبوو لەسەر ئەنتی ڤایرۆس بۆ پاککردنەوەی دلّەکان ، وە ئێمە پێویستیمان بە کەنالّی ﴿ HD ﴾ نیە هێندەی پێویستیمان بە دڵی ﴿ HD ﴾ یە .

٣٧. تۆ دەتوانی هەر شتێك بتەوێ بیکەیت بەلاّم هەموو شتێك نــا !!!

٣٨. لە ژیان چاوەروانی هەموو کەسێك مەکە چونکە کەسانێك هەن هەرگیز نایەن .

٣٩. ئەوەی لە ژیان وا لە زانست دەکات زیندوو بمێنێت کارپێکردنیەتی .

٤٠. ئێمە لە کۆمەڵگایەك دەژین کە ئافرەت فێری ئەوە دەکەین کاتێ ستەمی لێ دەکرێت بروات بۆ رێکخراوەکانی بەناو مافی ئافرەت ، لەجیاتی ئەوەی پیاوەکان فێربکەین کە ستەم نەکەن .

٤١. کەس بەکەم مەزانە ، سەیری باڵندەکان بکە بۆ بژێوی ژیانیان مێروو دەخۆن بەلاّم کاتێ دەمرن مێرووەکان ئەوان دەخۆنەوە .

٤٢. ئاسمان هەرچەند گەورە بێت مانگی تێدا نەبێت تاریکە ، مرۆڤیش هەرچەند گەورە بێت رەوشتی نەبوو بچووکە ، وە رەوشتت شەرمەنمەندیتە بە پارەش شەرمەت مەکرە و بەشەرمەفەوە پارە کۆبکەوە بۆ ئەو کاتەی ئەگەر هاتوو پارەشت نەما شەرمەفت بمێنێت .



٤٣. دەتوانین لە منداڵەکانمانەوە فێری چوار شت بین : ﴿ دڵخۆش بین بە بێ هۆ ، دڵەکانمان بە تاڵ بن لە رق و کینە ، هەردەم بە شتێکەوە سەرقاڵ بین ، ئەوەی دەمانەوێ بەدەستی بێنین دەبێ بەدەستی بێ نین ئەگەرچی بە گریانیش بێت ﴾ .

٤٤. ئیبلیس دەڵێ : سەرم سورماوە لە نەوەی ئادەم ، خودایان خۆش دەوێ و بێ فەرمانی دەکەن ، ڕقیشیان لە منە و گوێ رایەڵیم دەکەن ! .

٤٥. لەو کەسانە مەبە کە هیچ شتێك لە دەربڕینی ئازاد نازانن جگە لە جنێودان نەبێت .

٤٦. بولبول هەرگیز هێلانەکەی لەناو قەفەسدا بنیات نانێت ، تاکو بەچکەکانی فێری بەندایەتی و دیل بوون نەبن .

٤٧. وریای کەسایەتیت بە وەك دەرمان وایە بەدووری بگرە لە دەستی منداڵ .

٤٨. بزانە رێز لە کێ دەگریت چونکە کاتێ کە رێزت دانا بۆ ناکەسێ ، ئەڵێ بزانە چۆن لێم ئەترسێ ، پاشان فێردەبێت کە بە لەدەستدانی شتێك ئەوکات قەدری دەزانی .

٤٩. هەرکات کەسێك لە پڕا گرینگی پێ دایت بزانە ئەم گرینگیە " بەرژەوەندیە " .

٥٠. هەندێ لە مەسئوول و بەرپرسەکانمان لە دەرەوەی وولآت دەخوێنن ، ئەگەر نەخۆشکەوتن لە دەرەوە چارەسەر دەکرێن ، ئەگەر بچن بۆ گەشت دەچن بۆ دەرەوەی وولآت ، گشت کارەکانیان لە دەرەوەی وولآتە تەنها ئەوەی لە ناوەوەی وولآت ئەنجامی دەدەن " دزیکردنە " .

٥١. هەندێ جار پێویستە خەمبار بیت ، بۆ ئەوەی بیرت نەچێت بەختەوەری چەندە خۆشە .

٥٢. ئەگەر تۆ زانایت نەزانێك فێربکە ، ئەگەر دەوڵەمەندیشی فەقیرێك تێر بکە .

٥٣. زۆر جار ژیان وەك ئاوی لێدێت ﴿ نە تام ، نە بۆن ، نە ڕەنگی ﴾ دەبێت بەلآم مەجبورین بیخۆینەوە تەنها بۆ ئەوەی بتوانین بەردەوام بین .

٥٤. لەوانەیە کاتێك پرسیارێك بکەیت تا چەند ساتێك بە گەمژەت تێبگەن ، بەلآم ئەگەر پرسیار نەکەیت هەردەم بە گەمژەیی دەژیت و دەمریت .

٥٥. هەڵەی ئێمە لە شۆرشەکاندا ئەوەیە کە دەمانەوێت زاڵم بگۆرین لەجیاتی ئەوەی زوڵم بگۆرین ، هەر بۆیە زۆربەی شۆرشەکانمان هەرس دێنن .

٥٦. هەوڵدە لە هیچ کۆڕ و گفتوگۆیەکدا باس لە جیاوازی چینی کەسایەتی و نەتەوایەتی نەکەیت بەوەی کە من کوردم ، تۆ عەرەبی ، ئەو فلآن شتە نەوەك گرفت بۆ خۆت و دەوروبەرت دروست بکەیت ، وەجوانترین ووتەی سەعیدی نورسیم بیرکەوتەوە کاتێ باس لە ژیانی پاش ئەتاتۆرك دەکات و دەڵێت :-

( تاکو تورك نەیووت من تورکم ، عەرەب نەیووت من عەرەبم ، من نەمزانی کە کوردم ) !!! .

٥٧. لە کاتی تورەبوون وریای دەربرینی ووتەکانت بە لەوانەیە دروست و تەواو بێت بەلآم شێوازەکەی نادروست و هەڵە دەبێت .



٥٨. بزانە هیچ کەسێك قفل دروست ناکات بەبێ کلیل ، هەر لەبەر ئەمەشە خوا هیچ کێشەیەکت پێ نادات بەبێ چارەسەر .

٥٩. ئەگەر ویستت وولاتەکەت لە ژێر دەستی داگیرکەرە فکری و هزریەکان رزگار بکەیت ئەوا دە فیشەك گوللە بخەرە ناو دەمانچەکەتەوە نۆ دانەیان بۆ کەسە ناپاك و خاینەکان یەك دانەش بۆ دوژمنت چونکە ئەگەر ئەو ناپاك و خاینانە نەبونایە لەناوەوە دوژمن نەیدەتوانی هێرش بکات لە دەرەوە .

٦٠. ووریابە چۆن مامەڵە لەگەڵ خێزانەکەت دەکەیت ، چونکە خێزانت وەك مەشخەڵی ئاگر وایە ، ئەگەر زانیت چۆن دەستی پێوە بگریت ئەوا رێگات رووناك دەکات ، بەڵام ئەگەر بەهەڵە بیگریت ئەوا دەستت دەسووتێنێت .

٦١. لە خۆشەویستی رەشترین رۆژی ژینت بێ بەش مەبە چونکە جوانترین باران لەژێر هەورە رەشەکان دایە .

٦٢. کاتێ کە چاوت بە کتێبێکی باش دەکەوێت بیکرە ئەگەرچی نەشـــی خوێنیتەوە .

٦٣. ئەوەندە نەرم بە لە ژیان تا ئەو کاتەی دەچیتە دڵی هەموو کەس بەڵام نەگات بە ئاستێك چەواشە بکرێیت .

٦٤. لە کـــارێك بەژداری مەکە کە نەتوانی بەرگــــەی دەرئەنجــامەکــەی بگریت .

٦٥. هەردەم ﴿ دەم بەخەندە ﴾ بە چونکە خەندەکردن بەخۆراییە و کاریگەریشی بە پارە هەڵناسەنگێ .

٦٦. ئەگەر بۆ یەك جاریش بێت لە تەمەنت هەوڵدە گشت قورئانی پیرۆز بە تەفسیرەوە بخوێنیتەوە .

٦٧. ئەو منالەی کە دەزانێ شەقبوونی دەستی باوکی و گریانی شەوانەی دایکی لەبەر نەبوونی پارەیە ، چۆن دەتوانی لە قوتابخانە بنووسێ زانست باشترە لە پارە ؟! .

٦٨. قەت نەکەیت کاتژمێری دەست و جزدانی زۆر گرانبەها بکریت چونکە بیرت بێت تۆ کاتت نەکریوە کاتژمێرت کریوە وە ئەمە زیاتر سەرنجی دزەکان بۆلات ڕادەکێشێ

٦٩. منالەکانت لەکاتی دەست بەتاڵیاندا فێری کارکردن و خــــوێندنەوەی کتێب بکە .

٧٠. زۆر بە وورییایی هاوەڵ و هاوڕێی ژیانت دەست نیشان بکە چونکە ٩٠ ٪ ی خۆشی و ناخۆشی ژیانت بەو پەیوەست دەبێت .

٧١. کاتێ کە چــانسێ لە دەرگـــــات دەدات ، بۆ ســـەر خــــوانەکەش بانگی بکە .

٧٢. زۆر باش فێری یـــاســـاکانی ژیـــان بە ، پاشان هەندێکیان بشـــکـــێنە .

٧٣. هەرگیز بە جوانی کردەوەکانی شەیتان هەڵمەخەڵەتێ هەرچەند روخساریان بگۆڕێت ، هەربۆیە بۆئەوەی شکست نێنیت ، هەوڵدە شکست بە شکستەکانت بێنیت

٧٤. دڵخۆشبە بەوەی کە هەتە و کارکە بۆئەوەی کە دەتەوێ بەدەستی بێنی نەك بۆئەوەی کە نیتە .

٧٥. ئێمەی چاوساغ بۆیە نابینایین چونکە ئێمە وەکو خۆی لە ژیان ناروانین بەڵکو وەك خۆمان لە ژیان دەروانین .

٧٦. ئەوەندە ســـەرقـــاڵ مەبە بەشێوەیەك کە نەتوانی کەسانی نوێ بناسیتەوە .



٧٧. هەوڵدە زۆر دار سیواك بەکاربێنی چونکە لە پشت چەمانەوە دەتپارێزێ ، هەروەك زۆر قورئان خوێندن لە خەڵەفان دەتپارێزێ .

٧٨. دوور کەوە لە شوێنە گومان لێکراوەکان چونکە شتە خراپەکان هەر لەوێ روودەدەن .

٧٩. هەرەشە بە شتێك مەکە کە نەتوانی جێبەجێی بکەیت ، وە هەرەشە لە کەسێك مەکە کە دەزانی کاریگەریت بەسەریەوە نابێت .

٨٠. ئەگەر پیریت و لەگەڵ لاوێك کەوتیتە گفتوگۆوە باسی لاوێتی خۆت بۆ گەنجەکە بکە ، وە ئەگەر لاویت و لەگەڵ پیرێك کەوتیتە گفتوگۆ ئەو باسانەی بۆ باس بکە کە لە کەسێکی پیری پێش ئەو گوێ بیستی بوویت بەمە چێژ لە دانیشتنەکەتان وەردەگرن .

٨١. خۆت و خێزانەکەت فێری فریاگوزاری سەرەتایی بکە چونکە گشتمان بە رۆژگارێك دادەرۆین کە پەشیمان دەبینەوە لە نەزانینی شتە سەرەتاییەکان .

٨٢. کاتێ کەسێ پرسیارێکت لێ دەکات و تۆش حەز بە وەڵامدانەوەی ناکەیت پێی بڵێ ﴿ بۆچی دەتەوێ ئەمە بزانی ؟! ﴾ .


ئامادەکردنی:
مامۆستا عمر محمود فقی

٨٣. سێ شت هەرگیز لەدەست مەدە ﴿ هۆشت ، متمانە بەخۆت ، کەســـــایەتیت ﴾ .

٨٤. بەبیر کەس مەیەنەوە کە پیر دەبێ یان دەمرێ چـــونکە دەمێکە ئەوە دەزانێت .

٨٥. لای کەم ساڵێ جارێك گەشتێك بکە بۆ دەرەوە بەلاَم بە چاوێکی گەشبین و عەقلێکی کراوە سەیری دیمەنەکان بکە، تا پێشت دەکرێت مەرۆ بۆ شوێنی دووبارە.

٨٦. هەر کەسێك کە لە ژیان دەیبینیت لە شتێك شارەزایە ، هەوڵدە لێی فێربیت چونکە بەستنی پەیوەنی لەگەڵ کەسانی دەوروبەرت لە ژیان وەك بەستانی قۆپچە وایە تا نەگەیت بە کۆتایی نازانی بە هەڵە بە ستووتە .

٨٧. کاتێ کە دەچیتە نووسینگەیەك بۆ کرینی خانووێك ئاگاداری ئەم سێ خاڵە بە و بیکە بە مەرج بۆ کرینی خانووەکە ﴿ دراوسێکانت ، شوێنی خانووەکە و بەرزی و نزمی ، رووەکەی تاکرا لە قیبلە بێت ﴾ .

٨٨. هەوڵدە دەنگی باوك و دایکت تۆماربکەیت کاتێ کە پێدەکەنن یاخود ئەو کاتەی باسی هاوسەرگیری خۆیان دەکەن .

٨٩. جار جار چەپکێ گوڵ بە منالەکانت بۆ هاوسەرەکەت بنێرە پاشان بیر لە هۆیەکەی بکەوە .

٩٠. هەرگیز بێ هیوا مەبە ، چونکە ئەگەر شکست بوونی نەبوایە ئەوا سەرکەوتن تامی نەدەبوو .

٩١. گەر ویستت بیرەوەریەکی بەهێزت هەبێ هەرگیز ﴿ نەزەر ﴾ مەکە چونکە هەر وێنەیەکی حەرام خانەکانی مێشك بە ئەندازەی خەزنکردنی ﴿ ١٠,٠٠٠ ﴾ ووشە لە مێشك دەسووتێنێ .

٩٢. لە خواردنی ئەم سێ ژەهرە سپیە خۆت بە دوور بگرە ﴿ شەکر ، خوێ ، ئاردی سفر ﴾ ، وە بەرامبەر هەموو کەسێك وەفاداربە چونکە وەفاداری مرۆڤەکان زەمانە دەیسەلمێنێت نەك زەمـــان .



٩٣. هەرگیز نەخەویت تاکو ددانەکانت نەشۆیت بەلای کەمیش رۆژێ سێ جار دووانیان پاش نان خواردن جارێکیشیان پێش خەوتن .

٩٤. هەوڵدە بەلای کەم رۆژێ نیو کاتژمێر بە پێ هاتووچۆ بکەیت بەتایبەت لای کاتی نوێژی بەیانیان ، وە نیو کاتژمێریش پاش نوێژی عیشا ، وە هەوڵدە بەلای کەم رۆژێ شەش کاتژمێر بخەویت کاتژمێرێك پێش نیوەرۆ پێنج کاتژمێریش رێك پاش نوێژی عیشا .

٩٥. هەوڵدە لەو شوێنەی کە دەخەویت هەرگیز رۆناکی لێ نەبێت و دەرگای ژوورەکەشت داخە و قەڵەمێکیش یان دارسیواکێك لەسەر دەمی بەرداخی ئاو خواردنەوەت دابنێ و ﴿ بسم الله ﴾ بکە چونکە رۆژێك هەیە لە ساڵدا کە دەردێك لە ئاسمانەوە دادەبەزێ هەرچی بەرداخ و کوپی سەر کراوە هەیە لەم دەردە بێ بەش نابن ، جگە لەوانەی سەریان داخراوە و ﴿ بسم الله ﴾ یان لەسەر کراوە دەردەکە نایانگرێتەوە .

٩٦. بە پێویست دەزانرێ کە هەموو کات چەقۆیەك و چەرخێکت لە ناو سەیارەکەت پێ بێت ، ئەمەش بۆکاتی زەروور .

٩٧. دونیا تابلۆیەکە فلچەکەی ویستەکانمانە و شێوەکەی کردارەکانمانە و ڕەنگەکانی وشەکانمانە و چوارچێوەکەشی تەمەنمانە ، بۆیە نیگاری ژیانت جوان بکێشە .

٩٨. کاتێ کە هەڵەیەك دەکەی تەنها سێ شت هەیە کە پێویستە بیزانی ﴿ دان بە هەڵەکەت دابنێی ، پەندی لێ وەرگریت و بیکەی بە ئەزموون ، نەگەڕێیتەوە سەری ﴾ .

٩٩. هەرگیز کێشەکانت بەکەس مەڵێ چونکە ﴿ ٢٠ ٪ ی خەڵك گرینگی پێ نادەن ٨٠ ٪ خۆشحاڵن کە کێشەت هەیە ﴾ .

١٠٠. لە دوژمنەکانت خۆشبە بەڵام هەرگیز ناوەکانیان لە یاد مەکە .

١٠١. هەرگیز ڕێگە نەدەی بە کەسێك ببێتە کەسی یەکەمی تۆ لە کاتێکدا تۆ کەسی دووەمی ئەو بیت .

١٠٢. هەوڵدە لە هەڵەکانی رابردووی خۆت و کەسانی تر فێربیت وە پلان دانێی بۆ داهاتوو و بەیانیت ، لە یادیشت نەچێ کە تۆ تەنیا لە ئەمرۆدا دەژیت چونکە دوێنێ رۆیی و بەیانیش لەوانەیە هەرگیز نەبینیتەوە .

١٠٣. قەت ئەو شتە لەبیر مەکە کاتێ کەسێ لە کاتی تورەبوونیدا پێت دەڵێت چونکە راستیەکی ناودڵیەتی لەدەمی دەردەچێت .

١٠٤. لەو کەسانە نەبیت کە هەوڵدەدەن کەسانی تر بگۆڕن کەچی تاکو ئێستاش خۆیان نەگۆڕیوە چونکە ئەوانەی ناتوانن بیرکردنەوەیان بگۆڕن ناتوانن هیچ شتێکیش بگۆڕن.

١٠٥. لە یادت بێت باشترین کاتەکانی ژیان نەبینراون هەر لەبەر ئەوەشە لە کاتی ماچ کردن و گریان و خەو بینین چاوەکانمان دادەخەین .

١٠٦. خۆت بە گەوج نیشانبدەیت و کەسانیتر تووشی شۆك بکەیت باشترە لەوەی خۆت بە دانا نیشاندەی و تووشی بێ ئومێدیان بکەیت .



١٠٧. بیرت بێت هەر کۆسپێکی ژیان گەر نەتوانێت تێکت بشکێنێ ئەوا زیاتر بەهێزت دەکات.

١٠٨. گشت مرۆڤێك نووسەری ژیانی تایبەتی خۆیەتی تۆش ئەوە بزانە کە بەکارهێنانی قەڵەم جاف لەکاتی ئێستاتدا بۆ ئەوەیە کە ئاگاداری ئەوەبیت ڕەش کردنەوەی هەڵەکانی ژیانت چیتر ئاسان نیە .

١٠٩. وریابە ئەگەر کەسێك توانی بە نوکتەیەك بە پێکەنینت بێنێ ئەوا هەمان کەس دەتوانێ بەگریانیشت بێنێ چونکە سەرەتا توانی کار لە هەستەکانت بکات .

١١٠. ئاوێنەیەکی سادە بکە بە هاورێت چونکە بەبێ توانج هەڵە کانت نیشان دەدات وە ئەو کاتەی تۆ لەبەرامبەریدا دەگریت ئەو هەرگیز پێت پێ ناکەنێت .

١١١. کاتێ کتێبێکی نووسەرێکت دەخوێنیتەوە باوەڕ بەگشت نووسراوی کتێبەکە مەکە چونکە مرۆڤە نووسیویەتی .

١١٢. لە کارەکانت هۆشیاربە هەڵە نەکەیت یان وابکە کەمترین هەڵە ئەنجام بدەیت چونکە جارهەیە ئەنجام دانی هەڵەیەك تەنیا یەك چرکە دەخایەنێت بەڵام هەوڵدان بۆ چاککردنەوەی تەواوی ژیانی پێویستە .

١١٣. دەڵێن خۆشەویستی نابینایە ؟! ڕاستە ، چونکە دایکت بەر لەوەی لە ژیان بتبینێت خۆشی ویستووی .

١١٤. ئافرەت نیوەی کۆمەڵگەیە ، هەر ئەویشە نیوەکەیتر دێنێتە دونیاوە و پەروەردەی دەکات ، وە پێشکەوتنی هەر وولاتێکیش دەبێت بە پرسگەی پەروەردەدا تێپەڕبێت .

١١٥. هەرگیز لای کەس باسی خۆت مەکە مەگەر بۆ پەند وەرگرتن نەبێت لە هەڵەکانت وەك ئەزموونی ژیان چونکە هاورێکانت پێویستیان پێ نیە و دوژمنەکانیشت باوەرت پێ ناکەن .

١١٦. هاورێی راستەقینەت بەوە بناسە کە کاتێ دەگری یەکەمین فرمێسکت دەبینێ و دووەمت بۆ دەسرێتەوە و سێیەمیشت بۆ دەوەستێنێ .

١١٧. ئێمە بۆیە ڕابردوومان خۆش دەوێت چونکە ناگەڕێتەوە ، ئەگەر بگەڕابایەوە ئەوا ڕقمان لێ دەبوو .

١١٨. پیاسەکە کردنت لەگەڵ هاورێیەکت لە تاریکی باشترە لەوەی بەتەنیایی پیاسەکەیت لە رۆناکی دا چونکە دۆزینەوەی هاورێیەکی بەسۆز بلیمەتیە بۆ تۆ .

١١٩. کاتێ کەسێك پرسیارت لێ دەکات لێبووردەیی چیە ؟ بڵێ ئەو بۆنەیە کە گوڵ دەیدات لەکاتی وردبونیدا .

١٢٠. زۆر ووشەی داوای لێبوردن لەگەڵ کەسانی دەورووبەرت دووبارە کەوە چونکە داوای لێبوردن هەموو کات مانای ئەوە نیە کە تۆ هەڵەی و کەسی بەرامبەرت دروستە بەڵکو مانا گەورەکەی ئەوەیە کە تۆ پەیوەندی نێوانتان بە گەورەتر لەخۆت دەزانی وە لێبووردنی هیچ کەس رەتمەکەوە چونکە رەتکردنەوەی وەك ئەوە وایە ژەهر بخۆیت و چاوەرێی ئەوە بکەیت کە کەسانی تر بمرن .

١٢١. وریای ووتە و بیرۆکەکانت بە چونکە بیرۆکەکانت بۆ تۆ دەگەڕێتەوە بەڵام ووتەکانت بۆ کەسانیتر .



١٢٢. ئاگاداربە لە داوی خۆشەویستی چونکە پیاوان بە چاوەکانیان دەکەونە داوی خۆشەویستی و ئافرەتانیش بە گوێچکەیانەوە ، چونکە خۆشەویستی حەرام نیە بەڵکو گاڵتەکردن بە هەستی خەڵك لەژێرناوی خۆشەویستیەوە حەرامە .

١٢٣. هەندێ کات پێویستە ڕابکەیت تەنها بۆ ئەوەی بزانیت کێ لەدواتەوەیە .

١٢٤. زۆربەی سەرکردەکان بە ئافرەتە سەرنج ڕاکێشەکان لەناو دەبرێن بۆیە ئەگەر کچێك پێی وتیت خەونم پێتوە بینیووە کە خۆشمت دەوێ : پێی بڵێ وا چاکە هەردەم بخەویت .

١٢٥. هەوڵدە کەسێك بیت چەندین پیشە بزانیت کە هەرگیز بێ کار نەبیت بەمەرجێك ئەوەت لەیاد بێت کە خودای مەزن کرمی داوەتە هەموو چۆلەکەیەك بەڵام فڕێی نەداوەتە ناو هێلانەکەی .

١٢٦. هەرگیز هەوڵ مەدە هەموو کەس ڕازی بکەیت چونکە کلیلی سەرکەوتن نازانم بەڵام کلیلی شکست هەوڵدانە بۆ ڕازی کردنی هەموو کەسێك .

١٢٧. دەتەوێت ببیت بە کەسێکی سەرکەوتوو ؟ شتێك بزانە کە کەسی تر نەیزانێ بەڵام بۆ بەدەست هێنانی شتێك لە ڕێگایەك زیاتر تاقیبکەوە .

١٢٨. هەرگیز ناگەیت بە ئامانجەکانت ئەگەر بەردێ بگری لەهەر سەگێ کە لەسەر ڕێگات دەحەپێ ، چونکە ئەو کات نرخی یەك تاشە بەرد دێتە ریزی ئەڵماس .

١٢٩. ئامانجەکانت نزم مەکەرەوە بۆ بەرزکردنەوەی تواناکانت بەڵکو تواناکانت بەرز کەرەوە بۆ ئاستی ئامانجەکانت .

١٣٠. هەردەم ئەقلت بکە بەخاوەن بڕیار و دڵیشت بکە بە ڕاوێژکار چونکە دڵ بڕیار لەسەر هەستەکانت دەدات و ئەقلیشت لەسەر کردەوەکان .

١٣١. لەو کەسانە مەبە کە خەون بە سەرکەوتنەوە دەبینن ، لەو کەسانە بە کە لەخەو هەڵدەستن و کار بۆ سەرکەوتن دەکەن .

١٣٢. زیاتر ڕێگە بەخۆت بدە شکست بێنی بەوەی کە ڕێگە بەخۆت دەدەی سەربکەوی چونکە تۆ ڕێگایەکی نوێی هەڵسانەوە فێردەبیت .

١٣٣. هەردەم میهرەبان و بلیمەت و ژیر بە چونکە ژیری و میهرەبانی زمانێکە کە کەڕەکان دەیبیستن و نابیناکان دەیبینن .

١٣٤. بەشێوەیەك هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسانی دەورووبەرت بکە وەك ئەوەی بەیانی دەمرن .

١٣٥. وریای دڵت بە زۆرکات دڵت دەتوانێ ئەو شتانە ببینێ کە چاو ناتوانێ بیبینێ .

١٣٦. لەیادت بێت کە باشترین سیفەت بۆ سەرکردەکان ئارامی و دڵ فراوانیە .

١٣٧. گرینگی هەر مرۆڤێك لە ژیان بەوە پەیوەستە و پێوانە دەکرێت کە لە نێوان ژیان و مردنیدا زیادی دەکات ، ئەگەر زیادی نەکرد خۆی زیادە .

١٣٨. بۆ نابینا شوشەو ئەڵماس وەکو یەك وایە ، گەر کەسێك قەدری تۆی نەزانی تۆ شووشە نیت ئەو نابینایە ! .

١٣٩. یەك قسەی خۆشی پیاو دەتوانێ یەك مانگ خێزانەکەی لە زستاندا گەرم بکاتەوە چونکە مرۆڤی گەمژە هیچ شتێك لە زانا فێرنابێت بەڵام مرۆڤی زانا زۆرشت لە گەمژە فێر دەبێت بۆیە نە نەزان بە و نە گەمژە .



١٤٠. دڵنیابە بەختەوەری بەدزیەوە لەو دەرگایە دێتە ژوور کە نەتدەزانی بە کراوەیی جێت هێشتووە ، بۆیە سەرکەوتن کلیلی بەختەوەری نیە بەڵکو بەختەوەری کلیلی سەرکەوتنە .

١٤١. هەموو کەسێ لە ژیان جۆرێك لە بەختەوەری پێیە هەندێ کەس بە هاتنیان هەندێکیتریش بە ڕۆیشتنیان ، تۆش هەوڵدە لە هەردووکیان بیت .

١٤٢. کارێك مەکە کە متمانەت بەخۆت نەبێ ، کەسێکی متمانەداربە چونکە ئەو کەسەی متمانەی بەخۆیەتی متمانەی کەسانی تریش بەدەست دێنێ .

١٤٣. قەت نەکەیت کەسی نزیکت بکەیت بە دوژمن چونکە ئەو کەسەی لەناخەوە دوژمنی نەبێت لە دەرەوەش ناتوانرێ زیانی پێ بگات .

١٤٤. ڕێگە بەهیچ کەس مەدە لە کەسایەتیت کەم کاتەوە چونکە هەرگیز ئەم کارە ڕوونادات مەگەر بە ڕەزامەندی تۆ نەبێت .

١٤٥. ئەگەر وابزانی شتێك ڕاستە تەنیا لەبەر ئەوەی کەسانی تر لەو باوەڕەدان کەوایە تۆ بیر ناکەیتەوە .

١٤٦. هەردەم چاودێری خەونەکانت کە چونکە زۆرجار دەبن بە ڕاستی .

١٤٧. کەسایەتی تۆ لەو کارانەدا ڕەنگ دەداتەوە کە دەیکەیت کاتێ هیچ کەس ناتبینێت .

١٤٨. هەردەم بەهێز خۆت دەرخە کاتێ بێ هێزی وە بێ هێزخۆت دەرخە کاتێ بەهێزی .

١٤٩. هەوڵدە لە کاتی شکستی کەسێ قسەیەکی هاندەر بکەیت چونکە یەك ووشەی هاندان لە کاتی شکست زۆر بەنرخترە لە یەك کاتژمێر پێدا هەڵگوتن لەکاتی سەرکەوتن .

١٥٠. لە قوتابخانەی ژیان هەندێ کەس دەبینی بەر لەوەی قسە بکەن بیردەکەنەوە وە هەندێکیتریش دەبینی قسەدەکەن پاشان بیردەکەنەوە بەڵام مرۆڤی ژیر و دانا تەنیا زەردەخەنە دەکات و سەر دەلەقێنێ .

١٥١. هەرگیز لە هیچ مەجلیسێك هەڵە بۆ کەسێك ڕاست مەکەوە مەگەر شایستە نەبێت بۆئەوەی لە مەجلیسێکی تردا بناسرێ کە چەندە نەزانە .

١٥٢. مرۆڤی زیرەك لە ڕێگەی وەڵامدانەوەی پرسیار بناسە بەڵام مرۆڤی ژیر لە ڕێگەی پرسیارکردن .

١٥٣. باشترین مامۆستا ئەو مام وەستایەیە کە بزانێ چەکوشەکە لە شوێن خۆی بدات و قوتابیەکانی لە دڵەوە فێربکات پێش کتێب .

١٥٤. ڕێگە بەهیچ کەس مەدە تەواوی کەسایەتی تۆ دروست بکات چونکە زانا دەبێت بەوەی چۆن تێکیشت بشکێنێ .

١٥٥. هەرگیز چاوت لە دەستی کەسێك نەبێت کە خوا دوو دەستی وەك تۆی پێ بەخشیوە .

١٥٦. هەرکات بینیت لە ژیاندا بەختەوەر نەبوویت ، ئەوا هۆکارەکەی ئەوەیە کە داوای شتێك دەکەیت کە هی تۆ نیە هەروەها شتێکیش فەرامۆش دەکەی کە هی خۆتە ، وە هەوڵدە هاوڕێیەك بدۆزیتەوە ئاوێنەت بێت بەبێ پیت بتخوێنێتەوە و بەبێ ئاخاوتن لە چاوەکانت بگات و بەبێ بەرامبەریش خۆشتی بوێت .







١٥٧. کاتی خوان هەوڵدە بە ئامادەبوونی گشت خێزانت نانەکە بخۆیت و ئەگەر کراش تەلەفزیۆنەکە بکوژێنەوە بۆ ئەوەی خۆتان قسەبکەن .

١٥٨. کەسێك گلەیی دەکرد کە پێڵاوی نیە تا ئەو کاتەی کەسێکی بینی کە قاچی نەبوو هەر بۆیە لە بوون و نەبووندا سوپاس گوزاربە .

١٥٩. کاتێ کەسێ ڕووداوێکی گرینگی خۆی بۆت دەگێڕێتەوە گوێی بۆ بگرە و قسەی پێ مەبڕە .

١٦٠. کاتێ یاری لەگەڵ منداڵەکانت دەکەیت هەوڵدە ئەوان براوە بن .

١٦١. لە ژیان ترست نەبێ ! چونکە ترس ئەو شتەیە کە دەتوەستێنێ وە ئازایەتیش ئەو شتەیە کە بە جووڵەت دێنێ .

١٦٢. هەوڵدە خۆت فێری تەقاندنی چەك بکەیت بەتایبەتی دەمانچە و کلاشینکۆف ئەمەش تەنها و تەنها بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستی خۆیدا بەکاری بێنی .

١٦٣. بە خەڵك مەڵێ ئەم کارە چۆن ئەنجام دەدرێت ؟ بەڵکو ئەوەیان پێ بڵێ کە چی پێویستە بۆ ئەنجامدانی کارەکە ، لەم حاڵەتەدا دڵنیابە ڕێگای ئەوتۆت دەخەنە بەر دەست کە سەرت سور بمێنێت .

١٦٤. کاتێ داوات لێدەکەن کە شتێ ئیمزا کەیت ئەم سێ خاڵە لە یاد مەکە ﴿ زۆر بەباشی ناوەرۆکەکە بخوێنەرەوە ، ئەگەر بۆشایی لە نێوان ووشەکان هەبوو هەرگیز ئیمزای مەکە ، ئەگەر واژووشت کرد هەوڵدە ئەو ساتەی واژوو دەکەیت جووڵەی دەستت نەبینن ﴾ چونکە ئەمەت لەیاد بێت کە شتێکی کەمت پێدراوە و شتێکی زۆریشت لێ داوا کراوە وە هەردەم واژووت با لەسەرەوەی ناوەکەت بێت چونکە واژووکردن لە ژێر ناو واتای واژووی لە سێدارەدان دەگەیەنێت .

١٦٥. باشترین هاورێی هاوسەرەکەت بە و منداڵەکانیشت وا پەروەردەکە کە دایکیان لە سەرەوەی هەموویانە .

١٦٦. بڕوات بە هێزەکانت هەبێت چونکە ئەو دەستەی بتوانێ بێشکەیەك بهەژێنێت دەتوانێ جیهانیش بهەژەنێ .

١٦٧. بۆ گشت بوونەوەرێکی سەر گۆی زەوی نرخ و بەها دابنێ چونکە گشتیان بەهایەکیان هەیە لە هاوکێشەی ژیان .

١٦٨. ئەگەر ویستت رەخنە لە کەسێك بگریت ئەم کارە لە شوێنێکی خەڵوەت ئەنجام بدە و لە سەرەتاش باسی کارە چاکەکانی بکە .

١٦٩. عــەقڵ وەك ئیشارەتی ترافیك لایتە ، سەرەتا هێمنت دەکات پاشان ئاگادارت دەکات لە کۆتاییش رێت نیشان دەدات بەڵام وریابە لە رووداوەکان ناتپارێزێت .

١٧٠. بەر لەوەی پارە بە قەرد بدەیت بە دۆستێکت بەباشی بیرکەوە چونکە لەوانەیە هەردووکیانت لە کیس بچێت .

١٧١. کەسانێك لای خۆت دامەزرێنە کە لەخۆت بە تواناتر بێت .

١٧٢. جیاوازیەك لەنێوان قوتابخانە و بەندینخانە : قوتابخانە تاکەکان رێنمویی دەکات پێش ئەنجام دانی تاوان بەڵام بەندینخانە تاکەکان رێنمویی دەکات پاش ئەنجام دانی تاوان هەربۆیە وتراوە ئەوەی قوتابخانەیەك بکاتەوە بەندینخانەیەکی داخستووە .



١٧٣. هەموو شتێك بەو كەسە مەڵێ كە نایناسی ، گشت نهێنیشت لای هاورێت باس مەكە نەوەك ببێت بە دوژمن ، خراپیش مەبە لەگەڵ دوژمن نەوەك رۆژگار بیكات بە هاورێت .

١٧٤. لە یەكەم دیدارت لەگەڵ كەسێك یەكەم جار پرسیار لە باری بژێوی و ووردەكاری ژیانی مەكە هەوڵدە تەنها چێژ لە دانیشتنەكەتان وەرگریت .

١٧٥. تا پێت دەكرێت هەوڵدە پێت بۆ دادگا و شوێنە قەزاییەكان نەكرێتەوە .

١٧٦. هەوڵدە لە شەوانی هاوین ئەگەر لە مانگێك شەوێكیش بێت لە بانی ماڵەكەت بخەویت و لەسەر پشت راكشێیت و بەوردی سەیری ئاسمان و تیشكی ئەستێرەكان بكەیت و لە بوونیان تێبگەیت .

١٧٧. هەوڵدە لە كاتی مەوعد زووتر لە كاتی دیاری كراوی ئامادەبیت و درەنگتریش شوێنەكە جێ بهێڵیت .

١٧٨. ئەگەر بابەتێكی سەرنج راكێشی ناسراوێكی خۆت بینی لە گۆڤارێك یان رۆژنامەیەك ئەو بەشە ببڕە و لەگەڵ كورتە پیرۆزباییەك و دەست خۆشیەك بەنامەیەك بۆ خاوەنەكەی بگەرێنەرەوە .

١٧٩. فێری یاسای ئاخاوتن بە : هەرکات لەگەڵ کەسێك ئاخاوتنت کرد تەمەنی کەسەکە کۆ ( ٣ ) بکە پاشان بە ئەندازەی دەرئەنجامەکە قسەی بۆ بکە چونکە زیاتر لەکاتی خۆی ناتوانێت گوێت بۆ بگرێت ، بۆ نمونە ئەگەر کەسێك تەمەنی ( ١٥ ) ســـاڵ بوو ئـــەوا ( ١٥ + ٣ ) = ١٨ کەواتە بە ئەندازەی ( ١٨ ) خوولەك قسەی بۆ بکە چونکە زیاتر لەم کاتە بێزاری دەکات ، وە ئەم یاسایە بۆ تەمەنی منالی تا ( ١٨ ) ساڵی پەیڕەو بکرێت باشە ، وە لە سەرووی ئەم تەمەنەوە ئاسایی ئاخاوتنی لەگەڵ بکرێت تا ( ٢٠ ) چرکە .

١٨٠. هیچ پردێکی دۆستایەتیت مەروخێنە لەوانەیە ناچار بیت دیسان بە سەریدا بپەریتەوە .

١٨١. کاتێ لە ماڵی کەسێك دا نان دەخۆیت سوپاسی خوا بکە لەسەر خوانەکە و بەسەر چێشت لێنەرەکەشدا هەڵبڵێ ، وە نەکەیت لە حزووری کەسانی تر ددانەکانت پاك بکەیتەوە .

١٨٢. کاتێ دووکەس دێنە لات ناکۆکن بەر لە بڕیاردانت بەجوانی گوێ بۆ قسەی هەردوو لابگرە ئەگەر ئەو کەسە چاوی راستیشت بێت بێ ئامادەیی چاوی چەپت بڕیار مەدە .

١٨٣. هەندێ کەس لە مردنی ماسیەکان دەترسێ ئەگینا دەردی دڵی بە دەریا دەوت بۆیە ئەگەر ژیان تامی هەبوایە ئێمەی مرۆڤ بە گریانەوە لەدایك نەدەبووین .

١٨٤. هۆی سەرکەوتنی هەندێ کەس لەوەیە کە ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە کەسانی تر لەخۆیان ڕا نابینن ئەنجامی بدەن .

١٨٥. وامەزانە نرخی گرانی هەر شتێك نیشانەی باش بوونی شتەکەیە وە هەرزایشی نیشانەی خراپیەکەیەتی .

١٨٦. لەکاتی سەفەر کردنتدا پارچە کاغەزێك لە نێو جانتای پارەت دابنێ کە گشت زانیاری و ناونیشانەکەتی تێدا نووسرابێت ، وە هەموو کات ئەم کاتە بکە چونکە مرۆڤ ڕێبوارێکی کاتی دونیایە .



١٨٧. ئەو کتێبەی پێت خۆشە جارێکیتر بیخوێنەوە دڵنیام تامێکیتری لێدەکەیت و شتی نوێی لێ فێردەبیت .

١٨٨. ئەوها بژی کە لە کێلی گۆرت بنووسن ( ئەو کەسەی لە هیچ شتێکی ژیانی پەشیمان نەبۆتەوە ) .

١٨٩. هەرکات لە خەو هەڵدەستی وەرزش بە مێشك و ئەقلت بکە بەوەی کە هەندێ هاوکێشەی بیرکاری شیکاربکەیت ئەگەر سادەش بێت و هەندێ وێنەش بێنیتە بەر چاو کە نەتبینیبێ وەك ئەوەی سەیارەیەك لەسەر جادە بڕوات تایەی پێوە نەبێت چی ڕوودەدات و چۆن دەبێت ؟! .

١٩٠. ئەگەر لە کێ بڕکێی کارێکدا سەرکەوتی بێ ئەوەی کەس هانت بدات ئەوا پاش سەرکەوتنەکەت بڕۆ بۆ خۆشترین چێشتخانە خۆت خۆت بانگهێشت بکە بۆ خــــوان .

١٩١. خۆت بەو پێوەرانە هەڵســــەنگێنە کە خۆت دەیزانی نــــــەك بەپێوەری خەڵك .

١٩٢. بڕیاردەر و بە ئیرادە بە تەنانەت ئەگەر جارجار هەڵەش بکەیت .

١٩٣. لێمەگەرێ کەسانی تر تۆ لەو ڕێگایە لابەرن کە بۆ گەیشتن بە ئامانج گرتووتەبەر .

١٩٤. دووکات لێك جیاکەوە : کەی دەبێ بێدەنگ بیت وە کەی دەبێ قســــــە بکەیت .

١٩٥. بچووکترین پێشکەوتن بە ســــەرکــەوتــن بزانە .

١٩٦. ئێمە لە سەردەمی مۆبایلی هۆشمەندوو مرۆڤی گەمژەدیا ئەژین بۆیە گەیشتین بەم ڕۆژگارەی کە شەیتان تێیدا هاواردەکات " ئامادەمم بۆ بدۆزنەوە ســـوژدەی بۆ بەرم " .

١٩٧. هەوڵدە عاقلانە زەواج بکەیت تا عاشقانە ژیان بەسەر بەریت .

١٩٨. بەڵێن بدە خۆت کە لە ماوەی ساڵێکدا فێری بەکارهێنانی کۆمپیتەر بیت ئەگەرچی ئاستی سەرەتاییش بێت ، بەتایبەتی بەرنامەکانی ( Office ) و فۆتۆشۆپ و ئینتەرنێت .

١٩٩. شەش مانگ جارێك پشکنینی گشتی پزیشکی بۆ خۆت ئەنجام بدە .

٢٠٠. هەرگیز خۆت بە بەرپرس مەزانە ، خۆت بە بەرپرسیار بزانە ! .

٢٠١. مرۆڤ ئەوکات ئەرکێکی قورسی لەسەر شانە کاتێ هەست بکات هیچ ئەرکێکی لەسەر شان نیە .

٢٠٢. وا ڕەفتار لەگەڵ خەڵکانی تردا بکە کە هەست بە گرینگی خۆیان بکەن .

٢٠٣. بەلای کەم لە ڕۆژێکی هەفتە دا سەردانی بازاڕ بکە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاگاداری مانشێت و هەواڵی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بیت و نوێکاری بازاری ئەمڕۆت بزانی .

٢٠٤. وریابە هەر کات چاوپێکەوتنت لەگەڵ میدیا کارێك کرد ئەوە بزانە دوا قسە خۆیان دەیکەن و ئەوەی ئەوان بیانەوێ چاپی دەکەن .

٢٠٥. کاتێ کەسێك دێتە شوێنی کارەکەت لەبەری هەستەوە لەمەش گرینگتر ئەوەیە بتوانی لەیەکەم بینین دا کاریگەریت بەسەر بەرامبەرەکەتدا هەبێت .

٢٠٦. پێش ئەوەی تەمەنی منداڵەکەت بگاتە شەش ساڵ هەوڵدە بیبەیت بۆ باخچەی ئاژەڵان چونکە بینینی ڕاستی وێنەکان دەبێتە پردێك بۆ زووتر تێگەیشتن لە زانیاریەکان .

٢٠٧. هەردەم شوێنێکی تایبەت لە ماڵەوەت دەست نیشان بکە و خۆت وا ڕابێنە هەر کات چویتە ماڵەوە سویچ و جزدانەکەت لەوێ دابنێیت .



٢٠٨. منداڵەکەت فێری وەڵامدانەوەی تەلەفۆن بکە کە چۆن وەڵامداتەوە و فێری ئەزبەرکردنی ژمارەی تەلەفۆنی نزیکەکانیشی بکە .

٢٠٩. لە ئەمڕۆوە خۆت رابێنە کە نیو کاتژمێر زووتر لە خەو هەڵسیت دوای حەوت ساڵ دەبینیت حەوت رۆژ و نیوی رێك خراوەتە سەر کاتە بە ئاگا بووەکانت .

٢١٠. هەرگیز باجی دەوڵەت دوا مەخە و پارەی فایز لە هیچ کەس و بانقێك وەرمەگرە هەرچەند قازانجیش بێت .

٢١١. منداڵەکانت ئەوها کە هەن خۆشیانت بوێ نەك بەوەی کە تۆ دەتەوێ چونکە ئەوان بۆ رۆژگارێکی جیا لە رۆژگاری ئێوە دروست کراون .

٢١٢. هەمیشە بایەخ بە چۆنایەتی بدە نەك چەندایەتی ، واتە کوالێتی گرینگە نەك کوانتێتی ، وە رێگای ڕاست بگرە جا گرینگ نیە سێبەرەکەت لای خەڵك چەماوەبێت .

٢١٣. هەردەم لەناو سەیارەکەت وێنەیەکت و کۆپیەکی ناسنامە و ڕەگەزنامەت با لابێ .

٢١٤. ئۆتۆمبێلەکەت بەجۆرێك لێخوورە کە حەز دەکەیت لە دوا رۆژ منداڵەکانت ئەوها لێخورن وە رێز لە هێماکانی هاتووچۆ بگرە و بۆ منداڵەکانتی شیکەوە .

٢١٥. هیچ کات لە تەلەفۆندا ژمارەی نهێنی کاونتی بانق و ئیمەیل و فەیسبوکت مەدرکێنە .

٢١٦. هەوڵمەدە لەدوای خەم دا بگەڕێیت چونکە ئەگەر بێت ناونیشانی تۆ دەزانێ .

٢١٧. هیچ کات کۆتایی فلیمێك و کتێبێك بۆ کەس باس مەکە .

٢١٨. کاتێ کەسێکت بینی هێلکەیەکی دزی دڵنیابە ئاساییە مریشکێکش بدزێ .

٢١٩. ئەگەر کەسێك کارێکی بۆ ئەنجام دایت و نەتزانی کرێی خزمەتەکەی چەندە پێی بڵێ ﴿ حەقەکەتان چەندە تا بیدەم بە خزمەتتان ؟ ﴾ بەلاَم وا باشترە پێش هەموو کارێك مامەڵە بکەیت .

٢٢٠. هیچ کات دەرفەتێك بۆ پیاسەکردن لەگەڵ هـــاوســـەرەکــەتــدا لە دەست مەدە .

٢٢١. لەکاتی سەرکەوتنی پاس یان تەکسی سلاَو لە شوفێرەکە بکە و لەکاتی دابەزینیش سوپاسی بکە .

٢٢٢. ئەگەر کتێبێکت پێشکەش بە کەسێك کرد لەلاپەرەی یەکەمی کتێبەکەدا یاداشتێکی بۆ بنووسە چونکە دەرفەتەکانی ژیان خۆشیەکانی قەرزە و ناخۆشیەکانیش نەقدە .

٢٢٣. ئەو پارچە هۆنراوەی پێت خۆشە بە واتاوە ئەزبەری بکە .

٢٢٤. ئەگەر ناونیشانی شوێنێکت لە کەسێك پرسی داوای لێ بکە دوو جار بۆت دووبارە بکاتەوە چونکە رۆژ بەرۆژ بیناکان بەرزتر دەبن و دڵەکانیش بێ رەحم تر دەبن .

٢٢٥. هەر ئێستا کەمێ بیرکەوە بزانە دەتوانی کلیلی دەرگای ماڵەکەت بدەیت بە دوو لە هاورێکانت یان نا ؟ ئەگەر بینیت ناتوانی ئەوا هەر ئێستا بیر لە دوو هاورێی باشتر بکەوە بیدۆزیتەوە .

٢٢٦. بەر لە پێشکەش کردنی ووتار خواردنی قورس مەخۆ پێش ووتارەکەش کەمێ ئاو بخۆوە .

٢٢٧. با پۆشاکی بەرت لە هی موراجیعەکانت پۆشتەتر بێت و بەلاَم با لە هی بەرێوەبەرەکەت نەچێ .

٢٢٨. ئێمە لە هیچ شتێکا هێندەی مردن دڵنیا نین کەچی ئیش بۆ نەمری دەکەین .

٢٢٩. ئەگەر ناتەوێ پارێزگاری لە کەسێك بکەیت هیچ نەبێ مەیترسێنە .



٢٣٠. خۆت رابێنە پێش خەوتن بابەتێکی خۆش بخوێنیتەوە ئەگەر چیرۆك بێت باشتریشە ئەگەر قورئان بێت باشترینە .

٢٣١. شێوەی نانکردن و چێشت لێنان لە هاوسەرەکەتەوە فێربە .

٢٣٢. لە کاتی شووشتنەوەی وێنە لە دانەیەك زیاتر چاپ بکە زیادەکە بۆ ئەو کەسانە بنێرە کە لە وێنەکەدا هەن .

٢٣٣. ئەگەر ئافرەتێکت گەیاندەوە ماڵەکەی تا لەوە دڵنیا نەبوویت کە ئافرەتەکە بە سەلامەتی چۆتە ماڵەوە شوێنەکە بەجێ مەهێڵە .

٢٣٤. کاتێ بەکەسێك دەڵێی خۆشم دەوێیت ﴿ ئەمە بە کردەوە بسەلمێنە ﴾ .

٢٣٥. هەندێ جار بۆ ئەوەی پارێزگاری لەخۆت بکەیت پێویستە لە سەرەتاوە هێرش بکەیت.

٢٣٦. هیچ کات ئازایەتی لەوە دانیە ئەوەی باوەڕت پێی هەبێت بیڵێیت ، بەڵکو ئازایەتی لەوە دایە ئەوەی دەیڵێیت باوەڕت پێی هەبێت .

٢٣٧. کاتێك دەبینیت کەسێك کارە بچووکەکان بە چاکی ئەنجام دەدات ئەنجامدانی کاری گەورەی پێ بسپێرە ، بەمە زیاتر دەتوانیت سوود لە هێزە شاراوەکانی مرۆڤ وەرگریت و وەك گورزێك بەکاری بهێنیت و ڕێگای داهێنانیان پێ شەق بکەیت .

٢٣٨. هەرکات ویستت شتێك بکڕیت بیرت بێت ئەوەی گرینگ و بایەخدارە خودی شتەکەیە نەك ئەو نرخەی لەسەری نووسراوە .

٢٣٩. ئەگەر ڕاستگۆییت خاڵی لاوازی تۆ بێت لە ژیان بەوەی کە لە هیچ شوێنێکی کارکردن جێت نابێتەوە چونکە درۆ ناکەیت ئەوا تۆ بەهێزترین کەسی جیهانیت .

٢٤٠. لەو کەسە بترسێ لەخوا ناترسێ لەو کەسەش مەترسێ لەخوا دەترسێ .

٢٤١. هەوڵدە یەکەمین کەس بیت منداڵەکەت فێری سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بکەیت چونکە تاکە سورەتە زۆرترین کات دەیخوێنێت و لە ژیانی بەکاری دێنێ .

٢٤٢. سێ پەرتووکی منداڵانە بکڕە و بیخوێنەوە پاشان بیکە دیاری بۆ منداڵان وە هەوڵدە زیاتر کتێب بخوێنیتەوە و کەمتر سەیری تەلەفزیۆن بکەیت .

٢٤٣. هەوڵدە خۆت مامۆستای یەکەمی منداڵەکەت بیت و مامۆستای قوتابخانە دووەم بێت ، وە هەوڵدە پەیوەندی بەردەوامیشت هەبێت لەگەڵ قوتابخانەی منداڵەکەت .

٢٤٤. کاتێك ماڵت بۆ شوێنێکی تازە گواستەوە خۆت بە دراوسێکانت بناسێنە .

٢٤٥. لەکاتی سەردانکردنی نەخۆشێك بیرت بێت نزاکردن و ئومێد بەخشین باشترین چارەسەرە بۆ ئەو .

٢٤٦. بۆ ئەوە مەژی ناوبانگت هەبێ ، بۆ ئەوە بژی بەرهەمت هەبێ .

٢٤٧. ئەوەی ئازادبێت لە زیندانیش دا بێت ئازادە ، ئەوەی دیلیش بێت ئازادیش بێت هەر دیلە .

٢٤٨. کاتێ کەسێ داوای لێ کردی نزای خێری بۆ بکەی دەست بەجێ ئەم کارە بکە .

٢٤٩. کاتێ بەدیداری کەسێك گەیشتی کە حەزت بەبینی بوو بە زەردەخەنەوە خۆتی پێ بناسێنە و بڵێ ﴿ خۆشحاڵم کە بە دیدارتان شادبووم ﴾ .

٢٥٠. تا پێت دەکرێت لەجیاتی بەکارهێنانی حەب و دەرمان ، میوەجات بەکاربێنە .

٢٥١. قەت لەگەڵ کەسێك دا مامەڵە مەکە کە پێشینەی بردنی کەسێکی بۆ دادگا هەبێت .



٢٥٢. بەهیچ شێوەیەك لەپێش کەسانی تر سووکایەتی بە هـــاوسەر و منداڵەکانتدا مەکە .

٢٥٣. ئەگەر چوویت بۆ چێشتخانە داوای ئەو خواردنە مەکە کە لە ماڵەوە دروست دەکرێ .

٢٥٤. کاتێك ویستت ئەنجامدانی کارێك بە منداڵەکەت بسپێری پێی مەڵێ ﴿ باشە ﴾ ؟ پێی بڵێ ﴿ تێگەیشتی ﴾ ؟ .

٢٥٥. بۆ شـت کرین زوو برۆ بۆ بازار چــونــکە شتە باشەکان زووتر دەفــرۆشــرێن .

٢٥٦. ئەگەر بینیت چەند کەسێك وێنەی یەکتری دەگرن پێشنیاز بکە وێنەیەکی بە پێکەوەییان بۆ بگریت .

٢٥٧. ئەگەر کەوتیتە کێشە لەگەڵ هاوسەرەکەتدا هەرگیز باسی کێشەی کۆن مەکە .

٢٥٨. ئەو نامەیەی بۆ باوکت یان دایکت یان هاوسەرەکەت دەنێری بە کۆمپیتەر تایپیان مەکە بەدەست بینووسەوە و سوود لە پێنووس وەرگرە .

٢٥٩. هەستیار و دڵ ناسك مەبە ڕەخنە وەکو ستایش کردن قبووڵ بکە .

٢٦٠. ئەگەر لە چێشتخانەیەکدا میوانداری کرایت داوای خواردنێك مەکە کە نرخەکەی لە خواردنی میواندارەکەت بە نرختر بێت .

٢٦١. گەورەبوون لە تەمەن شتێکی ئیجبارییە بەڵام گەورەبوون لە عەقڵ شتێکی ئیختیارییە .

٢٦٢. هەرکات وێنەیەکت شۆردەوە دەست بەجێ بەرواری وێنە گرتنەکە و ناوی ئەو کەسانەی کە ئەندامی خێزانەکەت نین لە پشتی وێنەکەدا بنووسە .

٢٦٣. لەو کلیلانەی کە زۆر پێویستن دانەیەك زیاتریان لێ کـۆپی بکە .

٢٦٤. لە یادت بێت ئەو شتانەی کە راست و دروستن هەمیشە هەمووان حەزی پێ ناکەن وە ئەوشتانەی هەمووان حەزی پێدەکەن هەمیشە راست و دروست نین .

٢٦٥. هەفتەیەك بەر لە ئەنجامدانی دیمانە و ژوان قژی سەرت چاك بکە .

٢٦٦. بەو کەسەی خەمێکی قورسی هەیە مەڵێ دەزانم لە چ حال و وەزعێك دا دەژی چونکە لە ڕاستیدا نازانی .

٢٦٧. ئەوکات مافـەکـانت داواکە کە ئەرکـەکـانت بەجێ گـەیاندبێ .

٢٦٨. لە هەر تەمەنێك دا بیت لەکاتی سڵاوکردن دایکت لە ئامێز بگرە .

٢٦٩. سەیری بەرنامە زانستیەکانی تەلەفزیۆن بکە بۆ ئەوەی ئاسۆی دیدت فراوانتربێت .

٢٧٠. هەموو هەوڵت بدە بۆ زیادکردنی مووچەی مامۆستا و فەرمانبەرە دڵسۆزەکان .

٢٧١. وامەزانە ناردنی دیاری یان چەپکە گوڵێك قەرەبووی ئامادە نەبوونت دەکاتەوە .

٢٧٢. بەر لەوەی بچیتە ماڵی هەر هاوڕێیەك و خزمێکت بە تەلەفۆن ئاگاداریان بکەوە ، ئەگەر لەکاتی گەیشتنت پێی ووتی ببورە دەتوانیت کاتێکیتر بێیتەوە ئاسایی وەریگرە و بە قسەی بکە پاداشتت زیاترە .

٢٧٣. با هەردەم کامێرایەکی بچووك لەناو سەیارەکەت دا هەبێت ئەگەر ڤیدیۆشی هەبێت باشترە .

٢٧٤. ئەو یاریانە بۆ منداڵەکانت بکرە کە بە ڕێگەی خەیاڵ و بیرکردنەوەی ئەوان کاردەکات نەك بە پاتری .

٢٧٥. کەسایەتی منداڵەکەت ڕێك وەك سووپ وایە هەردووکیان لە ماڵەوە دروست دەکرێن .



٢٧٦. ئەو شتەی لە هەموو تەمەنتدا یەکجار دەیکڕی جۆرە باش و گرانبەهاکەی بکڕە .

٢٧٧. هەمیشە بۆ کاتی تەنگانە بڕە پـــــارەیـــــــەك لەناو سەیارەکەت بشـــــارەوە .

٢٧٨. شت لەو فوتابیانە بکڕە کە بۆ دابینکردنی خەرجی ژیانیان پشت بە فرۆشتنی بنێشت و شتی سادە دەبەستن .

٢٧٩. ئەگەر توانای ئەنجامدانی کاری گەورەترت هەیە کاتی خۆت بە ئەنجامدانی کاری بچووك بە فیرۆ مەدە .

٢٨٠. باوەڕت بە موعجیزە هەبێت بەڵام پێوەی پابەند مەبە .

٢٨١. ئەمە بزانە کە ئەگەر لە کڕینی نرخی شتێکدا لە خشتە برایت باشترە لەوەی لە چۆنیەتیەکەی لە خشتە ببرێیت .

٢٨٢. بۆ ناوبانگ کارمەکە بەڵام بە شێوەیەك کاربکە کە شایستەی ناوبانگ بیت .

٢٨٣. پێش ئەوەی وێنـــەی کەسێك بگریت مۆڵەتی لێوەربگرە .

٢٨٤. ئەگەر بەڕێوەبەریت یان مەسئول ، ئەوەت بیربێت کە هەرگیز یاسایەك لەبەر سپلیت دەربچێت لەبەر خۆر جێبەجێ ناکرێت .

٢٨٥. هەرگیز رێگە بە منداڵەکانت مەدە کە سەیری فلیمێك کەن کە حەز ناکەیت لاسایی هەڵسووکەوتەکانیان بکەنەوە .

٢٨٦. ئەگەر مناڵێکی بە ڕەوشتت بینی ستایشی دایك و باوکی بکە .

٢٨٧. هەرگیز خۆت لە کەس بە گەورەتر و بچووکتر مەزانە چونکە ئەگەر کەسێکت پێ گەورەبوو ئەوا دڵنیابە تۆ بچووکی .

٢٨٨. منداڵەکانت فێری ئەوە بکە کە بە سووکی سەیری کەم ئەندامان نەکەن .

٢٨٩. پیشەیەك هەڵبژێرە کە بە تەواوەتی خۆشت بوێ و خیانەتیش لە پیشەکەدا مەکە وە کارەکانت بەشێوازێك ئەنجام بدە کە شایستەی ستایش کردن بیت .

٢٩٠. دایکی خۆشەویست ، هەروەك چۆن چێشت لێنان فێری کچەکانت دەکەیت جارجار کورەکانیشت فێربکە .

٢٩١. هەوڵدە سەبارەت بە مێژووی وولاتەکەت زانیاری تەواوت هەبێت و جارجاریش کورتە هۆنراوەیەك بنووسەوە .

٢٩٢. هەر دەقێك لات جوان بوو بینووسەوە هەر شتێکیشت نووسیەوە ئەزبەری بکە هەر شتێکیشت ئەزبەرکرد بە کردەوە ئەنجامی بدە .

٢٩٣. بۆ ئەوەی کەسێك قەرزاری تۆ بێت کارێك بۆ منداڵەکەی ئەنجام بدە .

٢٩٤. ڕێز لەو کەسانە بگرە کە لە تۆ بە تەمەنترن و ئامۆژگاری ئەوانەش بکە کە لە تۆ بچووکترن .

٢٩٥. کاتێك ئەو کەسەی خۆشت دەوێت بە ئۆتۆمبێل لێت دوور دەکەوێتەوە تا ئەو شوێنەی کە دەیبینی سەیری بکە .

٢٩٦. هەرگیز نوکتەی نەشیاو لە پێش منداڵ و خێزانەکەتدا باس مەکە .

٢٩٧. ئەوانەی لە بارەی خۆشەویستیەوە شت دەنووسن مانای ئەوە ناگەیەنێت لە خۆشەویستی تێگەیشتوون چونکە ئەگەر وابێت منداڵ بێ باوکەکانیش دارشتن لەسەر باوانیان دەنووسن بۆیە باشتروایە هاوڕێ و دۆستەکانی منداڵەکەت بناسیت و چاودێری بەردەوامیان بکەیت .




٢٩٨. ئەو پەرتوکەی لەلات بە نرخە مەیدە بە کەسانیتر ، وە هەوڵدە هیچ کات نامەی کەسانیتر نەکەیتەوە .

٢٩٩. هونەری گـفـتـوگـۆ و چـــاوپێکەوتن فێربە .

٣٠٠.لە پرسەی کەسە نزیکەکانت هەرگیز دوا مەکەوە بەتایبەتی کاتی بەخاك سپاردن.

٣٠١. هەر کات گوێت لە دەنگی ئاگادارکەرەوەی ئامبیولانس و ئاگر کوژێنەوە بوو نزا بۆ نەخۆش و کەسەکان بکە تا سەلامەت بن .

٣٠٢. هیچ کات لە تاریکیدا حەب مەخۆ .

٣٠٣. دەم بە خەندەبوون لەکاتی سەرەمەرگدا ئاخاوتنێکە تەنها پیاوچاکان و شەهیدانی ڕاستەقینە تێیدەگەن .

٣٠٤. سـەختە لە قسەکانت تێنەگەن ، لەمەش سەختر ئەوەیە بە هەڵە لێت تێبگەن .

٣٠٥. بەهیچ شێوەیەك رەخنە لە دیاری مەگرە .

٣٠٦. گـەورەترین شـکـسـت ئەو شکستەیە کە هیچ ئەزموونێکی لێ فێرنەبیت .

٣٠٧. هەرگیز تەوقە لەگەڵ ئافرەتدا مەکە جگە لەو کەسانەی کە شەرع رێی پێ داویت .

٣٠٨. ئەوەی مردووەکان لە گۆڕدا لیی پەشیمانن ئێمە لێرە خۆمانی لەسەر بە کوشتن دەدەین .

٣٠٩.با لە هەریەك لەم چوار کەسە ﴿ مەلا ، پارێزەر ، رۆژنامەنووس ، شوفێرێکی تەکسی﴾ هاورێیەکت هەبێ چونکە ئەم چوار کەسە پێش هەموو کەسێ گرفتی کۆمەلگە دەزانن.

٣١٠. سەیرە ! ملیۆنەها کەس بەهیوای مانەوەن لە ژیاندا ، کەچی ناشزانن کاتەکانی ژیانیان چۆن بەسەر بەرن .

٣١١. هەردەم برێك پارە بۆ رووداوی چاوەروان نەکراو پاشەکەوت بکە .

٣١٢. تا پێت دەکرێت بەلای کەم لەم دوو کاتە دار بچێنە : لەکاتی لە دایك بوونی منالێکت ، وە لەکاتی مردنی کەسێکت دارێك لەسەر گۆرەکەی بچینە .

٣١٣. ئەگەر لە کۆبونەوەیەکی ئێجگار نهێنی بوویت لەبەرامبەر ئەو کەسەی کە دەبێ قسەی لەگەلدا بکەیت یەك ووشەش بێت بە ووتە مەیدرکێنە ! بەلکو گشتی گفتوگۆکانت لەسەر کاغەزێك بنووسە و با لەسەر کاغەزەکەش وەلامت داتەوە لە کۆتاییش هەموو کاغەزەکان بەدەستی خۆت بسوتێنە .

٣١٤. لە یادت بێت خوولەکێکی تورەیی شەست چرکەی خۆشیت لێ دەسێنێتەوە .

٣١٥. داوا لە داپیرە و باپیرەت بکە یادەوەریەکی باوك و دایکت بۆ بگێرنەوە .

٣١٦. گشت پێداویستیە فەرمیە حکومیەکانت سکان بکە و بەشێوەی وێنە زانیاریەکانت لە نێت لە پرۆفایلی تایبەتیت خەزن بکە .

٣١٧. هیچ کات دوای ئەوەی هاوسەرەکەت قژی خۆی کورت کرد پێی مەلێ کە قژەکەت جوان بوو .

٣١٨. کاتێك یاری تۆپی پێ دەکەیت لەگەل کەسێکدا یاری بکە لە تۆ بەتواناتر بێت .

٣١٩. لە بەرپرسەکەت بپرسە چاوەروانی چی لە تۆ دەکات .

٣٢٠. کاتێ لەگەل کەسێکدا دەدوێی بەردەوام سەیری کاتژمێرەکەت مەکە .

٣٢١. بیرت بێت کە خەفەت شتێکە مرۆڤی بێ ئەقل دەرخواردی مرۆڤی ئاقلی دەدات .

٣٢٢. لە بێ ئیشیان پڕ ئیش مەبە .





۳۲۳. هەر جارێ و داوا لە بەتەمەنێك بکە کە گەورەترین پەشیمان بوونەوەی خۆیت لە ژیان بۆ باس بکات .

۳۲٤. هەر کات کۆبونەوەت کرد پێش کۆبونەوە و پاش کۆبونەوە کەسەکان ئەژماربکە .

۳۲٥. هەندێ جار ڕێگە بە منالــەکانت بدە لە ژێر باراندا یاری بکەن .

۳۲٦. ڕێگە بە هیچ کەسێك مەدە بتکرێ جا بەهەر نرخێك بێت چونکە تۆ تا ئەو کاتە بەنرخیت کە نەکڕابیت گەر بتوانن بتکڕن تۆ نرخت نەما .

۳۲۷. هەرگیز مەبە بە هاوسەری کەسێك بەو ئومێدەی کە دواتر دەگۆڕێت .

۳۲۸. لەکاتی وەرگرتنی یەکەم مووچەت دا بۆ دایکت گوڵێك بکڕە و بۆ باوکیشت کتێبێك ، ئەوەی ماوەش بیدە بە هەژاران .

۳۲۹. هەرگیز کەسێك بەبێ ڕێزی بانگ مەکە تەنانەت ئەگەر بە گاڵتەش بێت .

۳۳۰. ڕەخنە لە هەڵسوکەوتەکان بگرە نەك لە کەسەکان .

۳۳۱. ئەوە فێری منالەکانت بکە کاتێ دەیانەوێ شتێ دابەش کەن بەشی یەکەم بدەنە لایەنی بەرامبەر .

۳۳۲.هیچ کات ناو یان ژمارەی تەلەفۆنی برادەر یان خزمەکانت مەدە کەسێکی بێزارکەر .

٣٣٣. لەکاتی یاریکردن هاندەری تیپی میللیەکەت بە ، وە هیوای بردنەوەی بۆ بخوازە لەهەمان کاتیشدا هیوای دۆراندن بۆ لایەنی بەرامبەر مەخوازە .

٣٣٤. هیچ کات بۆ کردنەوەی شتێك سود لە ددانەکانت وەرمەگرە و هەوڵمەدە چەقۆیەك لەکاتی بەربوونەوەدا بەدەست بگریتەوە .

٣٣٥. جاربەجار پیاسەیەك بەناو گۆڕستاندا بکە و نووسینی سەر بەردی کێلەکان بخوێنەوە .

٣٣٦. بچووکترین وانە لە کتێبەوە فێربە ؛ کە کتێبەکان قسەناکەن بەلاَم مرۆڤەکان فێری قسەکردن دەکەن .

٣٣٧. سەیری سورەتی یوسف بکە بە خەون دەستی پێکرد بە ڕاست و دروستی خەونەکانی کۆتاییان هات کەواتە تۆش متمانەت بە خەونەکانت هەبێت ڕۆژێك ببن بە ڕاستی .

٣٣٨. بیست ڕۆژ جارێك ژیاننامەی هاوەڵێکی خۆشەویست یان کەسایەتیەکی مەزن بخوێنەوە .

٣٣٩. ئەمە بزانە تەنیا پرسیار کە بێ مانا بێت ئەوەیە کە دەتەوێ پرسیار بکەی بەلاَم نایکەیت .

٣٤٠. هەوڵمەدە بۆ ئەوەی خەڵك تۆیان خۆش بوێت بەڵکو هەوڵدە تۆ خەڵکت خۆش بوێ .

٣٤١. کاتێك دەبینی منالەکەت فێری وانەیەکی نوێ دەبێ یان بە چیرۆکێکی مامۆستاکەی کاریگەر دەبێت یاداشتێکی سوپاس گوزاری ئاراستەی مامۆستاکەی بکە .

٣٤٢. ئەوە بزانە کە گرینگترین شت ئەوەیە کە گرینگترین شت بە گرینگترین شت بزانی

٣٤٣. ئەگەر ناتوانی ببیت بە نووسەرێکی بە هێز کەسانی تر بگۆری ببە بە خوێنەرێکی بەهێز خۆت بگۆرە ، بە واتایەکیتر نووسەرێك بە خوێنەرێك بە ئاگا بهێنیت ! .

٣٤٤. لەگەڵ ڕووەك و درەخت و ئاو و چیا و سروشت قسە بکە ، ئەوان تێتدەگەن .

٣٤٥. هەمیشە کەسانی تر بە نموونە هێنانەوە فێربکە .



٣٤٦. خێرا بیربکەرەوە و بەجدی کاربکە و بە هەموو هێزێك شەر بکە .

٣٤٧. لە هیچ نزا و پاڕانەوەیەکت دایك و باوك و مامۆستاکەت لەیاد مەکە .

٣٤٨. ئەو شـــتانە مـەکـــرە کەپێشـتر کـراو نەتەوە .

٣٤٩. بۆئەوەی بتوانی دەبێ بزانی ، بۆئەوی بزانی دەبێ بخوێنی کەواتە بخوێنە تا بتوانی .

٣٥٠. ابن عباس دەفەرمێ : خودای مەزن پلەی زانایان زیاتر بەرزدەکاتەوە بەسەر برواداران بە حەوسەد پلە کە نێوان هەر پلەیەك ڕێگای پێنج سەد ساڵە .

٣٥١. هیچ ڕۆژێك مەخەوە ئەگەر زانستێکی نوێ فێرنەبیت ! چونکە فێربوونی هەر شتێکی نوێ کەسایەتیەکی نوێت پێ دەبەخشێ .

٣٥٢. ئەو ئامۆژگاریەی مەلا غەریبی پێنجوینیت بۆ کچەکەی بیربێت کە دەفەرموێت : کچی شیرینم بخوێنە خوێندن لە داخوازی ئیمانە ، ( اقرأ ) فەرمانی قورئانە ، مەروانە هێز و پێزە جەکی شانە ، ئەوەی لە خوێندن بێ بەش بێت هەتا مردن پەشیمانە .

٣٥٣. هەرکات بیرۆکەیەکت بە مێشك داهات دەست بەجێ تۆماری بکە ، چونکە بیرۆکە وەك ڕووناکی مۆمە بۆ عەقل ، وە نەکەیت بەبێ سوود سەیری بیرەوەریەکانت بکەیت چونکە هەر بیرۆکە بچووکەکانن بیرۆکە گەورەکان دروست دەکەن .

٣٥٤. نەکەیت یارمەتی دەری کەسانی ستەمکار بیت ئەگەرچی بە دڵیش بێت ، دوورکەوە لێیان .

٣٥٥. هەر ڕۆژێك پێنج ووشەی ئینگلیزی فێربە بەڵام بە سێ مەرج : بزانە چۆن دەنووسرێ وە چۆن دەخوێنرێت وە بە چەند مانا دێت ، ئەوکات دەبینیت بەماوەی ساڵێك فێری ﴿ ١٨٢٥ ﴾ ووشە دەبیت ، لەو گرینگتریش ئەوەیە بتوانی ووشەکان لە ژیانی ڕۆژنەدا بەکاربهێنیت .

٣٥٦. هەوڵدە لەکاتی خوێندنەوەی کتێب بە ئەدەبەوە بیخوێنیتەوە چونکە لە ڕاستیدا تۆ بەرامبەر ئەقلی مرۆڤێکی نووسەر و مەزن مامەڵە دەکەیت .

٣٥٧. هەرکات کەسێك پرسیارت لێدەکات شارەزاییت لە بواری فلآن شتدا هەیە ؟ ئەگەر شارەزاییت هەبوو بڵێ کەمێك وە ئەگەر شارەزاش نەبوویت بڵێ نەخێر هەوڵدەدەم بیزانم چونکە نەزانین نیوەی زانستە و هەوڵدانیش تەواوکەریەتی .

٣٥٨. بۆ ئەوەی نرخی ڕاستەقینەی خۆت بزانی نرخی ئەو کاتانە بزانە کە خودا پێتی بەخشـــیوە .

٣٥٩. پێش ئەوەی بتەوێ ڕەخنە لە قسەی کەسێك بگری ڕەخنە لە قسەکانی خۆت بگرە وە پێش ئەوەی داوای بەڵگە لە کەسێك بکەیت خۆت بەبێ بەڵگە قسە مەکە .

٣٦٠. فێرنەکردنی کەسێك کە ئامادەی فێربوونە بەهەدەردانی مرۆڤایەتیە .

٣٦١. وریای ئامانجەکانت بە نەبن بە حەزوو ئارەزوو .

٣٦٢. ئەگەر توانیت بزانی منداڵەکانت گرفتی چیان هەیە وە قوتابیەکانت لەچی تێناگەن ئەوا نیوەی گرفتەکانت چارەسەر کردووە برۆ بەدوای نیوەکەی تردا بگەرێ چونکە دەست نیشانکردنی گرفت سەرەتای چارەسەرە .

٣٦٣. پێناسەیەکی بچووك بۆ ﴿ دایك و باوك و مامۆستا ﴾ : بریتین لەو سێ کەسەی کە هەرگیز ناتوانرێ پاداشتیان بدرێتەوە .




٣٦٤. ئێمە زۆر بەهەڵە لە سەرکەوتن گەیشتووین : سەرکەوتن دەرگا نیە بەڵکو قادرمەیە .

٣٦٥. هەرکات کتێبێکت خوێندەوە یا تێنووسێکت لابێ بۆ ئەو شتانەی کە سەرنجت رادەکێشێ تۆماریان بکە ئەگەر تۆماریشت نەکرد بە قەڵەمێك بە ووردی ئاماژەیان پێ بکە .

٣٦٦. لەکاتی خوێندنەوەی قورئان بە چاوی دڵ و عەقل قورئان بخوێنە وەك وتم خوێندنەوەی سورەتێکی وەك ئیخلاص بە تەفسیرەوە باشترە لە خوێندنەوەی سورەتی بەقەرە کە هیچ لە واتای تێنەگەیت چونکە خوێندنەوە بێ بیرکردنەوە و تێگەیشتن وەك قوت دانی خواردنێکە بێ جوین .

٣٦٧. هەر شتێك کە ئارەزووی دەکەیت و پێی ناگەیت پێش خەوتن بیدە مێشکت .

٣٦٨. ئەو ریزقەی بۆ تۆ دانراوە هەرچەند لاوازبیت پێت دەگات ، ئەوەی بۆ تۆش نەبێ هەرچەند بەهێزەوە بۆی هەوڵدەیت پێت ناگات بۆیە بە دڵنیاییەوە کاربکە .

٣٦٩. وریای زمانت بە ، جلەوی لە ژێر عەقلت دەرنەچێت .

٣٧٠. جوڵانەوەت مانای ژیانە لەسەر زەوی و مردنیش حەوانەوەیە لە ژێری .

٣٧١. ئەوەی ئەزبەر بکرێ زووتر بیر دەچێتەوە ئەوەی بنووسـرێ درەنگتر .

٣٧٢. هەوڵدە بەلای کەم هەفتەی جارێك ماسی بخۆیت و رۆژێ جارێکیش بەرداغێ شیر بەساردی بخۆیت و پاشان کەوچێکی بچووکیش ڕەشکە و هەنگوین بخۆیت .

٣٧٣. کاتێ خۆت بە ئازا بزانە کە دوای هەر شکستێك بزەیەك بخەیتە سەر لێوانت .

٣٧٤. بەداخەوە پێت سەیر نەبێت کە گەنج نازانێت و پیریش ناتوانێت .

٣٧٥.تا ئەوکاتەی کەسێك واز لە پرسیارکردن نەهێنێت خۆی تەسلیم بە نەفامی نەکردووە.

٣٧٦. ببە بە موگناتیس بۆ کەسانی دەوروبەرت بەشێوەیەك هاوەڵی کەسی باش بکە کە شتیان لێ فێربیت وە کەسی خراپیش لەبیرمەکە شتی باشت لێ فێربن تا بگۆڕێن .

٣٧٧. گرینگی تایبەت بە جل و بەرگت بدە و خۆت بۆن خۆش بکە چونکە بە رووخساری ژنێك هاوسەرەکەی دەناسی ، پیاویش بە جلی بەر خۆی ئافرەتەکەی دەناسرێ .

٣٧٨. لەگەڵ هەزار کەسدا راوێژ بکە بەلأم نهێنی خۆت لای کەسیان مەدرکێنە .

٣٧٩. هەوڵدە پێش کاتی بانگدان لە مزگەوت ئامادەبی چونکە ئەو کەسە بانگ دەکرێت کە غـافـلـە ! .

٣٨٠. گشت پەیوەندیە تەلەفۆنیەکانت بە گوێچکی چەپەت وەلأمدە چونکە هێزی بیستنی زیـاتـــرە .

٣٨١. هەوڵدە بە ئـارامیت ئارامی دوژمنت ببەزێنی .

٣٨٢. لەکاتی نووستن بەتایبەتی شەوان هەوڵدە لەسەر تەنیشتی لای ڕاست بخەویت و رووت لە قیبلە بێت و دەستی راستت لە بن سەرت بێت و بەدەست نوێژەوە بخەویت ، بەمە فریشتەکان تا بەیانی نزات بۆ دەکەن .

٣٨٣. دەزانی جیاوازی نێوان ئـاین و ئەخـلاق چیە ؟ مامەڵەی تۆ لەگەڵ خوا ئاینە بەلأم مامەڵەی تۆ لەگەڵ خەلقی خوا ئەخلاقە ، وە تێگەیشتن لە ئەخلاقیش خۆی لەخۆیدا ئەخلاقە هەربۆیە ئێمەی مرۆڤ زۆر سەیرین ﴿ نە حەزمان لە درۆیە نە بەرگەی ڕاستیش دەگرین ﴾ .



٣٨٤. هەندێك كەس هەیە زۆر قسە دەكات و هیچ شتێك ناڵێت ، هەندێ كەسیتریش هەن بێ ئەوەی قسەبكەن زۆر شت دەڵێن ئەمەیە واتای راستەقینەی ڕەوانبێژی لەبێ دەنگی دا.

٣٨٥. هەركات لەگەڵ خێزانەكەتدا كۆ بوویتەوە بۆ ( جماع ) بڵێ ﴿ بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا ﴾ ئەگەر خوا ویستی لەسەر بوو لەم شەو مناڵتان ببێت ئەوا دەستی شەیتان بەو مناڵە ناگات .

٣٨٦. هەركات بەسەر شوێنێكی هەوراز كەوتیت بڵێ ﴿ الله أكبر ﴾ ئەگەرچی لە ناو ئەسانسۆریش بیت ﴿ مصعد ﴾ وە لەكاتی نزم بوونەوەشدا بڵێ ﴿ سبحان الله ﴾ .

٣٨٧. بۆ ئەوەی هەرگیز تووشی نەخۆشی شێرپەنجە نەبیت ڕێك پاش نوێژی عیشا بخەوە و با ژوورت تەواو تاریك بێت ، وە تا سێیەكی شەو بخەوە پاشان هەڵسەوە شەو نوێژێك بكە و كتێبێك بخوێنەرەوە .

٣٨٨. بەلایەنی كەم با چاوەكانت لە شاشەی كۆمپیتەرەكەتەوە ﴿ ٨٠ ﴾ سم دووربێت وەلە ئاستی نزمی چاوت با ﴿ ٢٠ ﴾ سم نزمتر بێت ، وە هەرگیز لاپتۆپەكەشت بەبێ ناوبڕ لەسەر چۆكانت دامەنێ .

٣٨٩. مەهێڵە مناڵەكانت زۆربەی كاتیان لە یاری كردنی ئەتاری بەسەربەرن ، وە هەرگیز رێ مەدە ئەو شریتانەیان بۆ بكڕن كە دەبێتە هۆی شەڕ و توند ڕەووی بۆیان .


ئامادەكردنی:
ماموستا عمر محمود فقی

٣٩٠. گرینگ ئەوە نیە بەسەرکردە باشەکان بچیت گرینگ ئەوەیە سەرکردەیەکی باش بیت بۆیە وتراوە ﴿ ليس المهم أن تبدو بل المهم أن تكون ﴾ .

٣٩١. بە گاڵتەش بێت درۆ مەکە و جنێو مەدە .

٣٩٢. دوو هێندە رێز لە کەس و کار و خزمانی خێزانت بگرە .

٣٩٣. هەوڵدە چاکە لەگەڵ منالەکانت بکەی پێش ئەوەی لەدایك بووبن بەوەی کە دایکێکی باشیان بۆ بدۆزیتەوە تا ببێت بە هاوسەرت و پێی سەربەرزبن .

٣٩٤. هەرگیز تێل بە مۆبایلەکەت نەکەیت ئەگەر دانەیەك شەحنی تێدابێت بەتایبەتی ئەو کاتەی کە زەنگی بێ شەحنی لێدەدات چونکە زیانی دەبێ بەچەند قات ، وە هەرگیز نەکەیت پەیوەندی بە مۆبایلەوە بکەیت کاتێ کە مۆبایلەکەت بە شەحنی کارەباوە پەیوەستە چونکە مەترسی تەقینی مۆبایلەکەی لێ دەکرێت .

٣٩٥. تەنانەت لەکاتی ماچکردنی منالەکانیشت دادپەروەربە بەوەی کەسیان زیاتر و کەمتر لەویتر ماچ نەکەیت .

٣٩٦. هەوڵدە مۆبایلی منالەکانت بێ کامیرە و بێ بلوتوث و بێ میمۆری بێت ئەمە بۆیان باشترە .

٣٩٧. ئەگەر بۆکارێکی نهێنی بۆ شوێنێکی گومانلێکراو نێردرایت پێش چونت بۆ شوێنەکە بەو ئەندازە خۆراك بخۆ کە لەوێ هیچ شتێك نەخۆیت و نەخۆیتەوە .

٣٩٨. هەردەم چیرۆکی ژیاننامەی پێغەمبەران بۆ منالەکانت باس بکە نموونەش بەوان بهێنەرەوە .

٣٩٩. هەوڵدە لە ژیانتدا بەلای کەم کتێبێك بەچاپ بگەینیت ئەگەرچی ناميلکەش بێت .

٤٠٠. ئەگەر قسەت لەگەڵ منالێکدا کرد بەوەستانەوە قسەی لەگەڵ دا مەکە بەڵکو خۆت دانوێنە بە ئەندازەی ئەو ، پاشان فرمانی پێ بکە کارێکت بۆ بکات یان ئامۆژگاری بکە.



٤٠١. ئەوەی بەرد لە بیر دەگرێ چاوەڕێی دەنگی بەردەکە دەکات بە بنکەی بیرەکەوە بکەوێت ، هەربۆیە ئەو کەسەی جنێوت پێ دەدات چاوەڕێی کاردانەوەی تۆ دەکات وەڵامی دەیتەوە ، بۆیە وەڵامی ئەم جۆرە کەسانە وەڵام نەدانەوەیە بۆئەوەی وابیربکەنەوە ئەو بیرەی ئەوان بەردیان تێگرتووە هێندە فراوانە کە بنی نیە .

٤٠٢. تا پێت دەکرێت زوو لەخەو هەڵسە و بەرداخێك ئاو بخۆوە و کەمێ وەرزش بکە ، پاشان نانی بەیانی بخۆ و خۆت بشۆرە ئینجا برۆ کارکردن .

٤٠٣. ئەگەر بۆیەکەم جار لەگەڵ کەسێك چاوپێکەوتنێکت کرد با ماوەی نێوانتان مەترێك زیاتر بێت ئەگەر لە هەستی کەسەکە دڵنیا نەبووی تا دوو مەتر لێی دووربە چونکە ئەگەر نیازی خراپیشی هەبێت دەتوانی کۆنترۆڵی خۆت بکەیت .

٤٠٤. هەرگیز بلوزێك یان فانیلەیێك نەپۆشی کە نووسراوێکی لەسەر بێت مەگەر لە واتا و مانای نووسراوەکە دڵنیا بیت کە ئاساییە .

٤٠٥. ئەگەر دەتەوێت بۆ سالێك بەرهەمێك بڕوێنیت ئەوا گەنم بڕوێنە ، ئەگەر ویستت بەرهەمێ بۆ دە ساڵ بڕوێنێت ئەوا دارێك بڕوێنە ، ئەگەر ویستت بەرهەمێك بۆ زیاتر لە پەنجا ساڵ بڕوێنیت ئەوا کتێبێك بڕوێنە بەلام گەر ویستت بەرهەمێك بۆ هەتا هەتایی بڕوێنیت ئەوا مرۆڤێك بڕوێنە .

٤٠٦. ئەگەر دەتەوێت ببیت بەسەرکردەیەکی مەزن خزمەتی کەسانی شیاو بکە .

٤٠٧. ئەگەر خەونێکت هەیە دەتەوێ بیهێنیە دی لە ژیان ئەوا ئێستا یەك هەنگاوت پێویستە بکەیت ئەویش ئەوەیە کە لە خەو هەڵسیت و کاری بۆ بکەیت .

٤٠٨. تا پێت دەکرێت زۆرترین سۆز بە منداڵەکانت ببەخشە بەتایبەتی کچەکانت ، ووشەی خۆشم دەوێیت لای خێزان و منداڵەکانت زۆر دووبارە بکەوە بەشێوازێك لایان نامۆ نەبێت کاتێ کەسێك دەیەوێت هەڵیان خەڵەتێنێت .

٤٠٩. هەوڵدە ئادەمیزاد بیت نەك مرۆڤ چونکە ئەوەی ڕێزی لێگیراوە ئادەمیزادە نەك مرۆڤ .

٤١٠. ئەگەر کەسێك فرمانێکی خراپی پێ کردی و پاشان پێتی ووت ئەمە تەعلیماتە بڵێ ببورە تەعلیم ... مات !!!

٤١١. با هەمیشە گۆرستانێك لەناو دڵت هەبێت بۆ بەخاك سپاردنی هەڵەی هاورێکانت وە لەهەمان کات سندوقێکی سپاردەش لە نێو دڵت دانێ بۆ چاکەی ئەوان .

٤١٢. هەر کات لە ژیان گەیشتیت بە دەرگایەك بە قوفلێکی گەورە داخرابوو مەترسە بەدوای کلیلی دەرگاکە بگەرێ کە زۆر بچووکە چونکە ئەگەر بڕیار بوایە نەکرێتەوە ئەوا لە جێگای دەرگاکە دیواریان دروست دەکرد .

٤١٣. هەرگیز لەم ژیانەدا ئارەزوو مەکە لە شوێنی کەسێك بیت ، چونکە ئەگەر ئارەزووەکەت بەدی بێت ئەوا شوێنی تۆ لەم جیهانە بەتاڵ دەبوو .

٤١٤. کاتێك کەسێکت خۆشناوێت بەدرۆ پێی مەڵێ خۆشم دەوێیت چونکە چاوت ڕاستیەکەی پێ دەڵێت ، وە دەرگای دڵیشت بۆ هیچ کەسێك مەکەرەوە چونکە ئەوەی خۆشتی بوێت کلیلی لایە ، چونکە وشەی ﴿ خۆشەویستی ﴾ لە دوو وشەدا وەرگیراوە ئەویش بریتین لە ﴿ خۆشە + ویستنی تۆ ﴾ بە واتایەکیتر ویستنی تۆ شتێکی خۆشە بۆیە بۆتە خۆشەویستی .




٤١٥. هەوڵدە لەم کاتانەدا بەرۆژوو بیت ، لە رۆژانی ﴿ ١٣ ، ١٤ ، ١٥ ﴾ هەموو مانگێکی عەرەبی و لە تەواوی مانگی ڕەمەزان و رۆژانی عاشورا و نۆ رۆژی پێش جەژنی قوربان ﴿ نۆمینەی حاجیان ﴾ ، وە رۆژانی دووشەممە و پێنج شەممەی هەموو هەفتەیەك چونکە کتێبی کردەوەکانت تێیدا بەرز دەبێتەوە .

٤١٦. ناوی خۆش و مەزن لە منداڵەکانت بنێ چونکە ڕەنگدانەوەی لەسەر ژیانیان دەبێت .

٤١٧. قسە وەکو کلیل وایە ، ئەگەر بە باشی بەکارتهێنا یان دەوی خەڵك دادەخات یان دڵیان دەکاتەوە .

٤١٨. ئەگەر پێت کرا رۆژێ دوو ژەم نان بخۆ سبەینان و عەسران ئێوارانیش میوە .

٤١٩. ریزی هەموو ریش سپیەك بگرە بەڵام بە قسەی هەموویان مەکە وە دڵی هەموو منالێك بدەرەوە بەڵام بەنازیان مەکە .

٤٢٠. بە ڕای من ئینسان حزبی بێت بچووك دەبێتەوە بەڵام ئەگەر حیزب ئینسانی بێت گەورە دەبێت .

٤٢١. گەر خانووێکت لە گەرەکێکدا دروست کرد هەوڵدە بەرزی خانووەکەت بە ئەندازەی خانووی هاوسێکانت بێت نە نزمتر نە بەرزتر .

٤٢٢. قوتابخانەی ژیان زۆر مەزنە ، هەرچەند تێیدا بەرزبیتەوە جگە لە بڕوانامەی مــــردن ﴿ شهادة الوفاة ﴾ چیتر نابەیت .

٤٢٣. تا پێت دەکرێت رووەك بروێـنە و وێنـەی سـەوزایـی لە سـروشـتدا بنوێنە .

٤٢٤. دووربە لە کوشتنی گشت گیانداریك بەتایبەتی مێرووله و هەنگ و بۆق و پەپوسولەیمان .

٤٢٥. لەکاتی ئاو خواردنەوە هەوڵدە لە دانیشتن ئاو بخۆیتەوە و بە سێ قوم بخۆرەوە و هەرگیز هەناسەت مەخەرەوە ناو بەرداخەکەوە ، وە پێش گشت خواردن و خواردنەوەیەکیش ﴿ بسم الله ﴾ بکە و پاش هەموو خواردن و خواردنەوەیەکیش ﴿ الحمدلله ﴾ بکە .

٤٢٦. فەلسەفەی ئاینی ئیسلام یەکتر ناسین و بەرپاکردنی ئاشتیە لەنێوان بەندەکان ، هەربۆیە خودای میهرەبان فەرموویەتی ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا ﴾ نەك ﴿ لتعاركوا ﴾ !!! .

٤٢٧. گەورەیی خودا لەچاو دروستکرا و بەندەکانی چەندە گەورەیە ؟! کتێبەکەشی کە قورئانە لەچاو کتێبەکانی تر هێندە گەورەیە ، بۆیە بەسە گەورەیی بۆ کتێب کە خوداش کتێبی هەیە .

٤٢٨. ئەگەر گومانت کرد لەنێوان ئاین و زانست ئەوا بزانە هیچ شتێك مانای گومان ناگەیەنێت لە نێوان ئەم دووەدا چونکە ئاین لە ئاستێك دا قسەدەکات کاتێك زانست لەو ئاستەدا دەوەستێت .

٤٢٩. مەڵێ من گەورەم چۆن سەر بۆ بچووکێك دانوێنم ! سەیری وانەی لۆجیك کە لە دوڵك و بەرداخ کە گەورە سەر بۆ بچووك دادەنوێنێ .

٤٣٠. لەگەڵ هەموو کەسێك لە ناخۆشی و خۆشی ئامادەبە ، کۆمەڵایەتی بە لەگەڵ زۆربەشیان ، نزیکتربە لەگەڵ هەندێکیان ، هاوڕێ بە لەگەڵ کەمێکیان بەڵام دوژمن مەبە لەگەڵ هیچ یەکیان ، وە هەوڵدە وەك دوێنێ بیرنەکەیتەوە چونکە بەیانی دەتگەینێت بە رۆژێکی وەك ئەمرۆ .




٤٣١. ئەگەر کەسێك لێتی پرسی کاتە دەست بەتاڵەکانت بەچی بەسەر دەبەیت ؟ بڵێ ببورە ئاخۆ مرۆڤ کاتی بەتاڵی هەیە ؟!

٤٣٢. پێش هەموو شتێك دادوەری خوا لەوە ببینە کە کات و مردنی بە یەکسانی بەسەر گشت دروست کراوانی دابەش کردووە کە بۆ هەر رۆژێك ﴿ ٢٤ ﴾ کاتژمێرە و گۆرستانیش کۆتا ماڵمانە .

٤٣٣. ئەگەر کەسێك هاتە لات پێی ووتی فلان کەس بە خراپە باسی تۆی دەکرد ! لە وەڵامدا پێی بڵێ شەیتان کەسی نەدۆزیەوە بیکات بە پۆستەچی مەگەر تۆ نەبێت ؟!

٤٣٤. بیرکردنەوەت لەوەی کە چی بڵێی ؟ باشترە لە پەشیمانی لەوەی کە بڵێی بۆچی ووتم ؟!

٤٣٥. پێش ئەوەی هەر قسەیەك بکەی قسەکەت بکێشە پاشان بیچێژە جا ئەگەر باش بوو بیبێژە ئەگەرنا بینێژە .

٤٣٦. قەت لە بەخشینی کەم شەرم مەکە چونکە نەبەخشینی لەو کەمترە .

٤٣٧. باس لەو شتە مەکە کە نایزانی زێدە رۆییش مەکە لەوەی کە دەیزانی .

٤٣٨. گرینگی بەم دوو شتە بدە : ( فێربوونی زمان ) و ( بەستانی کامێرای چاودێری ) بۆ ماڵکەت و شوێنی کارەکەت چونکە هەر کەس فێری زمانی نەتەوەیەك بێت لە فێڵیان دوور دەبێت و بە کامێراکەش بەرچاورونیت لە دڵنیایی کارەکان زیاتر دەبێت .

٤٣٩. باوکی بەڕێز پێش ئەوەی هەوڵدەی منالەکان و کوڕەکانت بۆت وەك پێغەمبەر ئیسماعیل بن چەقۆ لەسەر ملیان دانێیت و قسە نەکەن ئەوا سەرەتا دەبێت تۆ وەك پێغەمبەر ئیبراهیم بیت پاشان ئەوان دەبن بە ئیسماعیل .

٤٤٠. زۆر گرینگە بیرت بێت کە گشت مرۆڤەکان لە خۆل دروستکراون وە خۆشەویست دەفەرموێت هەرکەسێك جۆرێکە لە کانزا بۆیە ئەگەر کەسانی بەرامبەرت بوون بە ئاسن لە ڕەقیدا ئەوا تۆ وەك پێغەمبەر داوود بە لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئاسندا چونکە خودا ئاسنی بۆ ئەو نەرم کردبوو چۆنی ویستبا وای چانەکرد .

٤٤١. زۆرجار پێویست دەکات یاسایەکی نوێی دادوەری دامەزرێنی ئەویش ئەوەیە کە ببیت بە دیکتاتۆرێکی دیموکراسی بەواتا ﴿ دیکتاتۆرێکی دادپەروەر ﴾ ! .

٤٤٢. هەرگیز سەیری بچووکی گوناه مەکە ، سەیرکە بێ فەرمانی کێت کرد ؟!

٤٤٣. فێری خراپە بە نابۆئەوەی خراپەی پێ بکەیت بەڵکو بۆ ئەوەی خراپەی پێ بناسیتەوە و لێی دوورکەویتەوە .

٤٤٤. وەك ئەو ماسیە مەبە کە گشت ژیانی لە نێو حەوزێکدا بەسەر دەبات بەڵکو هەوڵدە بچیتە ناو زەریا ئەو کات دەزانی چ جیهانێك چاوەڕێتە .

٤٤٥. زۆرمان بیستووە کە خەڵك دەڵێن کاکە ئەم کارە مەکە بە قسەم بکەو لە شوێن خۆت مەڕۆ چونکە بەرد لە شوێن خۆی سەنگینە تۆش بڵێ ببورن من ئەو بەردەنیم ئەوەی تۆ دەیڵێی ، من یاقوتم ئەمیش لە گشت شوێنێك سەنگینە ! .

٤٤٦. هەرگیز گفتوگۆ و ململانێ لەگەڵ کەسێك دا مەکە چی نەبێت لەدەست دا .

٤٤٧. ئەوانەی پرسیاری ئەوەت لێ دەکەن ئاخۆ بۆ ئاینی ئیسلام پەرە ناسێنێ و کۆنە پەرستیە ؟ بڵێ بۆ داوای ئیسلام دەکەی پەرەبسێنێ و پێشکەوێ بۆ داوای پەرەسەندن و پێشکەوتن ناکەیت ئیسلام بێت ؟! ، بۆیە دەڵێین :-

﴿ Islam is up to date but, we need to up date ﴾ .






٤٤٨. زۆر کەس هەیە لە ژیان بە ناراستەوخۆیی دەتکوژێت هەروەك بۆ کوشتنی باڵندەیەك تیرکەوان هۆکار نیە بەڵکو باڵەکانی ببڕە رۆژێ سەدان جار بە ئاواتی فڕین دەمرێت .

٤٤٩. کەم زانین و زۆر ووتن وەك کەم دەرامەتی و زۆر خەرج کردنە .

٤٥٠. هەوڵدە زۆر لەگەڵ کەسانی هەژار نان بخۆیت بۆ ئەوەی فێری سوپاس گوزاری ببیت .

٤٥١. هەرکات ویستت لە سنووری مرۆڤایەتیەوە دەربچیت سەردانی ئەم چوار شوێنە بکە ﴿ شێتخانە ، نەخۆشخانە ، زیندان ، گۆڕستان ﴾ پاش گەڕانەوەت کەمێك تێ فکرە و بیرکەوە کە چەندت لەم نیعمەتانە پێ بەخشراوە کە کەسانیتر لێی بێ بەشن ؟! .

٤٥٢. مەبە بە گورگ بەسەر مەڕان ، مەبە بە مەڕیش لە ژێر دەستی گورگان هەوڵدە ناسنامەی مرۆڤایەتیت لەدەست نەدەیت .

٤٥٣. لە خوا داواکە و روو بکە خۆر ئەوسا گشت سێبەرەکان دەکەونە دواتەوە .

٤٥٤. ئەگەر ئەو کەسە باش بێت کە کاری باش ئەنجام دەدات ، ئەوا لەو باشتر ئەو کەسەیە کە کاری خراپ ئەنجام نادات .

٤٥٥. یەکێك لە نیشانەکانی سەرکەوتن لە کۆتایی دا گەڕانەوەیە بۆلای خوا لە سەرەتادا .

٤٥٦. ئیرەیی بەکەس مەبە چونکە ئیرەچیەکان زووتر دەمرن و ئیرەییش دەمێنێت .

٤٥٧. دوورکەوە لە خواردنەوەی مەی و مادده هۆشبەرەکان چونکە مرۆڤ لە مرۆڤ بوون دەخات .

٤٥٨. لە کەسانی نابیناوە فێربە کە پێ بۆ هیچ شوێنێك درێژ ناکەن مەگەر بە گۆچان دڵنیا نەبن لێی .

٤٥٩. لە چاکە کاران بە چونکە خوا وای کردووە چاکەکاران لەکاتی مردنیش دا زیندووبن وە دوورکەوە لە خراپەکاران چونکە خودا ئەوانی وەك مردوو لێ کردووە ئەگەرچی زیندووش بن .

٤٦٠. هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کردوویت پاداشتی بکە ئەگەرچی بە خەندەیەکیش بێت .

٤٦١. ئەگەر هەموو شتێکیان پێ بەخشیت و ئازادیان لێ سەندیەوە ئەوە بزانە هیچیان پێت نەبەخشیوە .

٤٦٢. زۆر ئاسانە بگەیت بە دەسەڵات بەڵام زۆر ئەستەمە بڕیار بدەیت .

٤٦٣. هیچ کاتێك شەڕ مەکە چونکە لە شەڕدا کەس نیە براوە بێت بەڵکو گشت دۆڕاون .

٤٦٤. لەهەر بونێکدا ئامانجێك هەیە ، بیرکەوە ئامانج لە بوونی تۆ چیە ؟! .

٤٦٥. گەر بتەوێ : دەتوانی بە دەرزیەك بیرێك هەڵگەنیت بەڵام ئارامی دەوێت .

٤٦٦. وریای خۆشەویستی بە وەك دارستانی ئەمازۆن وایە بەچاو نوقاندنێك تێیدا وون دەبیت .

٤٦٧. دوو ئەوەندە پاداشتی ئەو کەسانە بکە کە رەخنەت لێدەگرن و رێت نیشاندەدەن .

٤٦٨. ئێمە ئەوکات لە مردن نزیك دەبینەوە کاتێ کە لە دایك دەبین .

٤٦٩. ژیری ﴿ دە ﴾ بەشە ﴿ نۆ ﴾ بەشی لە بێدەنگی دایە بەشێکیشی لە قسەکردنە .

٤٧٠. هەرگیز گفتوگۆ لەگەڵ گەوج و نەزان مەکە چونکە هەرگیز لێی نابەیتەوە .



٤٧١. هەرگیز ستەم نەکەیت چونکە هیچ بیرەوەریەك لەسەر زەوی هێندەی بیرەوەری ستەم لێکراو بەهێز نیە .

٤٧٢. بە ڕاستگۆییەوە بازرگانی بکە هەردەم براوە دەبیت .

٤٧٣. سوربە لەسەر مردن ژیان بەدەست دێنی چونکە ئەگەر بمابایەن مردن نەدەبوو مادام مردن هەیە کەواتە ئێمەش نامینێین .

٤٧٤. باسی خەڵك مەکە باسکردنیان دەردە باسی خوا بکە باسکردنی دەرمانە .

٤٧٥. ئەگەر خەنجەرێکت دا بە نەزانێك ئەوا تۆ بکوژێت .

٤٧٦. گەر ویستت سەیری گەوجی ئینگلیزەکان بکەیت سەیری فلیمەکانیان بکە بەڵام گەر ویستت سەیری بلیمەتیان بکەیت ئەوا سەیری ئامێرەکانیان بکە چیان بەرهەم هێناوە هەر بۆیە لەمەوە فێربە کە ژیان هیچ شتێکت پێ ناڵێت بەڵکو پێت نیشان دەدات .

٤٧٧. مرۆڤەکان دوو جۆرن ؛ هەیانە سەیری خۆڵ دەکات هەشیانە سەیری خـــۆر دەکات .

٤٧٨. بۆ ئەوەی ژیانێکی ئاسودە بژیت دڵخۆش مەبە بەوەی کە هەتە و غەمگین مەبە بەوەی کە نیتە ، بەمە فێری وانەی سوپاس گوزاری ڕاستەقینە دەبیت .

٤٧٩. ئەگەر برسی بوویت بەو ئەندازە نان بخۆ کە برسیەتیت بشکێت نەك تێر بخۆیت ، وە گەدەت بۆ سێ بەش دابەش بکە ، بەشێکیان بۆ خۆراك بەشێکیتریش بۆ خواردنەوە کۆتا بەشیش با بۆ هەوا بێت .

٤٨٠. لەو کەسە مەبە کە بەهرەکەی خۆی دەگوزێت بەوەی کە نازانێ چۆن مامەڵەی لەگەڵدا بکات .

٤٨١. کارێك مەکە کە کەسانی تریش بتوانن بیکەن ، قسەیەك مەکە کە کەسانی تریش بتوانن بیڵێن ، شتێ مەنووسە کە کەسانی تریش بتوانن بینووسن شوێن پێی کەسانی تر مەکەوە چونکە شوێن پێی خۆت وون دەبێت ، کەواتە خۆت خودی خۆت بە داهێنەر دەبیت .

٤٨٢. هەردەم ببە بە گەورەی هێزو و تواناکانت و لەهەمان کاتیش ببە بە دیلی ویژدانت .

٤٨٣. هاورێیەتی ئەو کەسە مەکە کە هاورێیەتی هەموو کەسێ دەکات .

٤٨٤. سەرکردەی سەرکەوتوو ئەو کەسەیە کە کۆنترۆڵی عەقلەکان دەکات پێش جەستەکان .

٤٨٥. بەو چەکە لەگەڵ دوژمنت شەڕ بکە کە ئەو ترسی لێیەتی نەك ئەوەی تۆ ترست لێیە .

٤٨٦. هەموو مرۆڤێك ئاواتێکی هەیە و هەموو کارێکیش کاتێکی هەیە هەموو ووتارێکیش شوێنی خۆی هەیە بۆیە وریابە بزانە ئاواتت چیە و چ کاتێك ئەنجامی دەدەیت .

٤٨٧. خراپەی کەس بۆکەس مەڵێ مەگەر بۆ ئاگادار کردنەوە نەبێت .

٤٨٨. لەو کەسە مەبە کە نایەوێت بیرکاتەوە چونکە توندڕەوە ، وریای ئەو کەسەش بە کە ناتوانێ بیرکاتەوە چونکە گەوجە ، خۆت بە دوور بگرە لەو کەسەش کە ناوێری بیرکاتەوە چونکە دیل و بەندەی زیندانی خەیاڵیەتی ، ئەم زیندانەش سنووری نیە .

٤٨٩. زۆر لە خوا داوا بکە پێش ئەوەی پیربیت و زەلیل بیت بۆ خۆی بتگەڕێنێتەوە چونکە پیربوون جگە لە جۆرێك لە ماوەی منالی چیتر نیە .



٤٩٠. کاتێك کە منالێك دەبینی لە چواریانەکانەوە حەلوا دەفرۆشێت ئەوا بزانە ئەم حەلوایە خەونی زۆربەی منالآنە کە تامی بکەن کەچی ئەو منالە بۆ بژێوی ژیانی خۆی خەونی خۆی دەفرۆشێت ! .

٤٩١. بۆ ئەو شتە هەوڵدە کە ئەنجامدانی لە تواناکانی تۆ بەرزترە و خەونی مەزنت هەبێت چونکە ئەستێرەکان بۆ ئەوە بەرز دروست کراون کە هەردەم لەو بیرکردنەوە دابین کە پێیان بگەین و نابێ ئەوەشت لە یاد بچێ کە قاچەکانت لەسەر زەوین .

٤٩٢. هەرگیز دەرگـــایـــەك مەشکێنە کە کـــرانەوەی بە کلیل ئـــاســـان بێت .

٤٩٣. عەقلت جامێك نیە پڕ بکرێت بەلکو رووناکی مەشخەڵێکە دەبێ داگیرسێت .

٤٩٤. بە میوانی لەماڵی هیچ کەسێك لە سێ رۆژ زیاتر مەمێنەرەوە ئەگەرچی کەسانی نزیکیشت بێت .

٤٩٥. لە وولآتانی ئێمە کەسانی بلیمەت و هونەرمەند بە زیندوویی هیواکانیان دەکوژرێت و بە مردوویش پەیکەریان بۆ دەکرێت .

٤٩٦. لێك چواندنێك هەیە لە نێوان بیرکردنەوەکانت و منالەکانت : هەروەك چۆن منالەکەت پێ جوانترین منالە ، با بیرکردنەوە پۆزەتیڤەکانیشت بە هەمان ئەندازە بێت .

٤٩٧. ئەگەر کەسێك داوای لێ بووردنی لێ کردیت بڵێ ﴿ خوا بمان بورێت ﴾ !؟ .

٤٩٨. مرۆڤە ئاساییەکان چاویان بەهێزە و بینینیان لاوازە بەڵام کەسانی سەرکردە هەرچەند چاویشیان لاواز بێت هەر ئاستی بینینیان بەهێزە و بێ سنوورە .

٤٩٩. ئەگەر کەسێکت بینی چەندین سیفەتی باشی هەیە و مەی دەخواتەوە یان درۆ دەکات ئەوا بزانە تۆ نابینایت .

٥٠٠. زۆر گرینگە لە ژیان مرۆڤ بتوانێ بە زمانێك زیاتر قسەبکات بەتایبەتی زمانی ﴿ عەرەبی ﴾ پاراو چونکە زمانی ئەهلی بەهەشتە .

٥٠١. کە جامت خستە سەر لێوت خەشیمانە ، گەر ژەهریشی تێدابوو گوناهی خۆتە بیزانە .

٥٠٢. دڵنیابە ژیری بە گەورە و بچووکی نیە ، بژێو پەیداکردنیش بە زانایی و نەزانی نیە ، خۆشەویستیش بە بینین نیە ، مردنیش نا یەکسانی تێدا نیە .

٥٠٣. نووسەرە مەزنەکان بەوە بناسە لەگەڵ نووسینی هەر بابەتێکدا تاڵێك مووی سەریان سپی دەبێت .

٥٠٤. هەرگیز ئاوات بە دیداری دوژمن مەخوازە .

٥٠٥. هەر کەس گفتوگۆی لەسەر شتێك کرد بزانە لە عەقل سادەکانە ، وە هەر کەس گفتوگۆی لەسەر کەسایەتیەك کرد بزانە لە عەقل ناوەندەکانە ، وە هەر کەس گفتوگۆی لە سەر بیرۆکەکان کرد بزانە ئەوە لە کەسە عەقل گەورەکانە و ئومێدی سەرکردایەتی لێ دەکرێت .

٥٠٦. ئاگاداری نەزان بە کاتێ دۆستایەتیت دەکات هەروەك ئاگاداری زانا دەبیت کاتێ دوژمنایەتیت دەکات .

٥٠٧. ئەگەر بۆ جارێکیش بێت لە ژیاندا لە مزگەوت بانگێك بدە .

٥٠٨. هەوڵدە خوا بە گەورەیی خۆی بناسیت و بەندەکانیشی بە نوری ئەو بناسیتەوە .



٥٠٩. لە ژیان ئاگر بە بەلاّم کەس مەسوتێنە ، ئاو بە بەلاّم کەس مەخنکێنە ، مۆم بە تاریکی ببەزێنە ، ئادەمیزاد بە گەورەیی و جیاوازیت لە مرۆڤایەتی بسەلمێنە .

٥١٠. خێر و چاکە بەخۆراییە بۆچی وەریناگریت ؟!

گوناهکردن بە پارەیە بۆ دەیکڕیت ؟! .

٥١١. ئەگەر شاعیرێکت بە شیعرەکەی نەناسی دیارە شایستەی ناسین نیە ، وە ئەگەر نووسەرێکیشت بەنووسینەکەی نەناسی بزانە شایستەی نووسین نیە ، ئەگەر لە ژیان کەسەکانت وەك پێویست نەناسی ئەوا بزانە ژیان شایستەی تۆ نیە .

٥١٢. ئەگەر خۆشەویست ﴿ محمد ﴾ د.خ لە نێواماندا بمابایە بۆئەوەی دوو رووەکان ریسوا بکات ئەوا تا ئەمرۆش سەرقالّی ئەم کارە دەبوو .

٥١٣. ئەوەی تۆی ئادەمیزاد لە جیهانی گیانداراندا جیادەکاتەوە ئەوەیە کە ئادەمیزاد تاکە بوونەوەرە کە بتوانی بە حەزەکانی بلّێ نـــا ، وە تاکە زیندەوەرە شەرم بکات و خەندە بکات ، وە تاکە زیندەوەرە کە بتوانێت لەسەر پشتدا بخەوێت ( ئەمەش بۆ ئەوەیە کە زالّ بێت بەسەر خراپەکان و دەم بە خەندە بێت بۆ هاوەلاّن و زاناش بێت بۆ بیرکردنەوە لە بوونی بوونەوەردا ) .

٥١٤. زۆر ئەستەمە بۆ دایکێك کە ﴿ ٢٠ ﴾ ساڵ پەروەردەی منالەکەی بکات بۆئەوەی بیکات بە سەرکردەیەکی بلیمەت ، کەچی لە هەمان کات زۆر ئاساییە بۆ دایکێکیتر بە ﴿٢٠﴾ چرکە وا لە کوڕەکەی بکات هەڵەیەك ئەنجام بدات بە گشت تەمەنی باجی هەڵەکەی پێ نەدرێت .

٥١٥. ئەگەر بە خوێندنەوەی کتێبێك هەڵەیەکی ژیانت ڕاست کردەوە ئەوا کتێبەکی بەسوودت خوێندۆتەوە ، وە ئەگەر کتێبەکە توانی وا لە تۆ بکات یەك رستەش بێت لە مێشکتدا بچەسپێنێ ئەوا بزانە نووسەرەکە کەسێکی سەرکەوتوو بووە .

٥١٦. داواکردن لە بەندە وەك داوا کردنی دیلە لە دیلێکی تر ، هەردەم لە خوا داواکە چونکە ئەو خاوەن زیندانی دونیا و جیهانی ئاخیرەتە .

٥١٧. ماندووترین کەس ئەو کەسانەن کە ناتوانن کاتەکانیان بەسەر کارەکانیان دابەش بکەن.

٥١٨. لەگەڵ منالٚ منالٚ بە و لەگەڵ کەسانی پیریش پیر بە نەك لەگەڵ منالٚدا پیربیت و لەگەڵ پیریشدا منالٚ بیت .

٥١٩. هەموو هێزێك لاوازە ئەگەر پەرت و بڵاوو بێت وە هەموو لاوازێکیش بەهێزە ئەگەر هێزەکانی یەکگربێت .

٥٢٠. ئەگەر ویستت نرخی پارە بزانیت هەوڵدە کەمێکی لێ قەرزکەیت .

٥٢١. ئەوەی بتوانێ هەنگاوی یەکەم بنێت ئەوا نیوە هەنگاوی ناوە بۆ کۆتایی .

٥٢٢. ئامۆژگاری پاش بێ رێزی کردن بۆ کەسێك وەك تەداوی کردنی مردوویێك وایە .

٥٢٣. دەتەوێت ببیت بە کەسێکی سەرکەوتوو ؟! ئەگەر بەڵێ ، ئەوا پێویستە لە ژیان لەدوای ئەو کەسانەدا بگەرێیت کە حەز بە سەرکەوتن دەکەن ، ئەگەر ئەوانەت نەدۆزیەوە ئەوکات پێویستە لە دوای ئەو کەسانەدا بگەرێیت کە ڕقیان لە شکستە ، بەمە دەتوانیت فێربیت کە زۆرجار بۆ کوژاندنەوەی ئاگر پێویستە لێی نزیك بیتەوە .




٥٢٤. هەردەم زانستی جیاواز فێربە لە بوارەکەت چونکە ئەگەر سوودت پێ نەگەینێت زیانیشت پێ ناگەینێت .

٥٢٥. خێراترین ڕێگا بۆ ناسینی سەرەتایی کەسانی دەوروبەرت تورەکردنیانە .

٥٢٦. هەرکەسێ باسی ئازادی بۆ کردیت پێی بڵێ ( ببورە ئەوەی من زانیبم تاکو ئێستا خودی ئازادی ڕاستەقینە دیلە و ئازاد نەکراوە ) !!!

٥٢٧. وێنەکێشی بلیمەت بەوە بناسە کە وێنە بە عەقلی دەکێشێت نەك بە دەستی .

٥٢٨. پاشاکان دادوەرن بەسەر خەڵکەوە ، زانایانیش دادوەرن بەسەر پاشاکانەوە .

٥٢٩. ئەو کات خۆشەویستی دەمرێت کە لە گەشەکردن بوەستێت .

٥٣٠. ووشەی ( هۆش ) لە هۆشداریەوە هاتووە بۆیە گوێدرێژەکان هەستیان پێ کرد کەچی تاکو ئێستا هەندێ لە گوێ کورتەکان هەستی پێ ناکەن !!!

٥٣١. مرۆڤ ئاساییە هەڵە بکات بەڵام گرفت ئەوەیە دەستگربێت بەهەڵەوە .

٥٣٢. چارەنووسی هەموو نەتەوەیەك پەیوەستە بە گەنجەکانیەوە ، مێژووی هەموو نەتەوەیەکیش پەیوەستە بە سەرکردەکانیانەوە .

٥٣٣. زانست و بەرژەوەندی وەك ئاوی سوێرە چەندی لێ بخۆیتەوە زیاتر تێنوو دەبیت .

٥٣٤. ئەوەی مرۆڤ لە گیانلەبەر جیادەکاتەوە عەقڵ نیە بەڵکو ویژدانە .

٥٣٥. چۆن بەوە رازی نابیت کە ببیت بە بەندەی کەسێك بەوەش رازی مەبە کە ببیت بە گەورە بەسەر کەسێك .

٥٣٦. هەردەم کەسە تەمەڵەکان بۆ کاری قورس هەڵبژێرە چونکە دڵنیابە رێگا چارەی وا دەدۆزنەوە کە بە خەیاڵیشت نەهاتبێت .

٥٣٧. گوڵێك بەدیاری بدە بە هاورێکانت باشترە لە چەپکە گوڵێك کە ببرێ بۆ سەر گۆریان .

٥٣٨. ئامۆژگاری لە کەسێك وەربگرە بە دیارتەوە بگریت و لە دواتەوە پێنەکەنێ .

٥٣٩. مرۆڤی سەرکەوتوو کەسێکە کە لە تاریکیدا بەدوای رۆشنایی دا بگەرێت نەك چاوەرێی ئەوە بێت تا رۆژ دەبێتەوە .

٥٤٠. سیاسەت : ئەو هونەرەیە کە نەهێڵیت خەڵك بەوە بزانێت کە تۆ مەبەستتە .

٥٤١. ئەگەر لێیان پرسیت دەزانی بۆچی ئاسمانەکان ئەوەندە جوان و روونن ؟ بڵێ چونکە دەستی مرۆڤی پێ نەگەیشتووە .

٥٤٢. وریابە وەك ماسی نەبیت ، ڕاستگۆیانە هەڵە بکەیت و لەناو بچیت چونکە ماسی بێ ئەوەی بزانێ " قولاپ " نیشانەی چ پرسیارێکە خێرا وەڵام دەداتەوە .

٥٤٣. وریای خۆت بە وەك گڵۆپی سەر جادە نەبیت بزانە بۆ کێ دەسوتێیت .

٥٤٤. بە وەستان لەسەر پێ کانت کەمێك رووبەرت داگیرکردووە ، بەڵام بە وەستانت لەسەر هیوا و ئامانجەکانت دڵنیابە گشت دونیا داگیردەکەیت .

٥٤٥. هەرکات دوژمنت ویستی قوتت بدات ببە بە ژەهر بۆی .

٥٤٦. کاتێ کەسێ جارجار درۆت بۆ دەکات و بە پێکەنینت دێنێ بە گەمژەت تێدەگا پێی بڵێ : ئەی بۆ جارێ بیرناکەیتەوە کە من بە گەمژەیی تۆ پێدەکەنم ؟! .

٥٤٧. باوك : ئەو کەسەیە کە ئامادەیە گشت شەقامەکان گسك بدات تا ژن و منداڵەکانی ماڵی هیچ کەسێك گسك نەدەن ، وە هەوڵمەدە هەموو کات دوژمنەکانت بناسیت چونکە دەبێتە هۆی لەدەست دانی زۆربەی دۆستانت .



٥٤٨. گرینگ ئەوە نیە پاش مردنت چی بۆ منالەکەت بەجێ دەهێڵیت گرینگ ئەوەیە چ جۆرە منالێك بەجێ دەهێڵیت .

٥٤٩. نهێنی خۆت بۆ کەس مەڵێ و نهێنی خەڵکانیش بپارێزە .

٥٥٠. چاوەڕوانی ڕووداوەکان مەبە تۆ بگۆڕن بەڵکو خۆت ڕووداوەکان بگۆڕە .

٥٥١. هەموو کەس بناسە بەڵام هاوڕێیەتی هەموو کەس مەکە ، هەموو شوێنێکیش شارەزابە بەڵام بۆ هەموو شوێنێك مەڕۆ ، هەموو شتێکیش ببینە بەڵام باوەڕ بە هەموو شتێك مەکە .

٥٥٢. جیاوازی نێوان ئێمە و وولاَتانی پێشکەوتوو ئەوەیە کە ئێمە دژایەتی زیرەکەکان دەکەین تا شێت دەبن ، ئەوانیش یارمەتی شێتەکان دەدەن تاکو چاك دەبن .

٥٥٣. ڕێزی خۆت بگرە با ڕێزت بگرن ، ئەوەندەش بدوێ کە گوێت بۆ بگرن .

٥٥٤. بیرت بێت هەموو کەوتنێك مانای کۆتایی نیە چونکە کەوتنی باران جوانترین سەرەتایە .

٥٥٥. زانست لە خوێندنەوە بەدەست دێت ، ژیریش لە ژیان .

٥٥٦. سەر بەرزترین مرۆڤ ئەو کەسەیە کە هیچ شتێك لە بەندە داوا ناکات تەنها لە خودای بەندەکان نەبێت .

٥٥٧. بلیمەت ئەو کەسەیە کاتێ روو بەرووی زەریا دەبێتەوە کەشتیەك دروست دەکات و سەرئاو دەکەوێتەوە نەوەك دیوارێك دروست بکات روو بەرووی مەرگی لافاو بێتەوە .

٥٥٨. ئەگەر هەواڵی ئابرو بردنی کەسێك گەیشتە لای تۆ رایبگرە با لە تۆوە دەرنەچێت .

٥٥٩. دەبێت مرۆڤایەتی سنورێك بۆ جەنگەکان دابنێت ئەگەر نا جەنگەکان سنوورێك بۆ مرۆڤایەتی ناهێڵنەوە .

٥٦٠. ژیری لەوەدایە کە بزانی چی دەکەیت ، کارامەیی لەوەدایە کە چۆن بیکەیت ، سەرکەووتن لەوەدایە  کە بیکەیت .

٥٦١. بیرم دێت دراوسێ یەکمان لە برسا مرد کەچی خزمەکانی لە پرسەکەیدا مەڕیان بۆ سەر بڕی ، وە  بیرم دێت کەسێکیان گرت بە تۆمەتی ئەوەی پارچە نانێکی دزی بوو کەچی لە زیندانا رۆژێ سێ جار بەخۆرایی نانی پێ دەدرا ئەمەیە " یاسا و نەریت " وای لە مێروولە کردووە دەربازی نەبێت کەچی لەهەمان کات گەورەیی قەبارەی فیل وای کردووە نەبینرێت !!!  .

٥٦٢. لە ڕاشکاوی وەکو گورگ بە کە هەرگیز خەندە ناکات لەرووی نێچیرەکەیدا ، وە تۆبەکردن بە زوبان بەبێ دەست هەڵگرتن لە گوناه تۆبەی گورگە ، تۆبەی گورگیش مەرگە .

٥٦٣. ئەگەر ﴿ مێشکی ﴾ بەتاڵیش وەك سکی بەتاڵ قۆرەقۆری بکردایە ئێمەی مرۆڤ زۆر لە ئێستا عاقڵتر دەبووین .

٥٦٤. ئیسلام و موسوڵمان دووشتی لێك جیان ، ئیسلام لوتکەیە و هەموو شتێکە بەڵام پارێزەرانی هیچ شتێك نین ، بۆیە ئەگەر ویستت ڕەخنە بگریت پێویستە ڕەخنە لە موسوڵمان بگریت نەك ئیسلام ، وە ئەوەی کامڵە ﴿ ئیسلامە ﴾ نەوەك موسوڵمان چونکە مرۆڤ بێ بەرنامە و کەتەلۆك ناژێ واتە ئەستەمە ژیان بێ تێگەیشتن لە قورئان و ئاینی پیرۆزی ئیسلام .




٥٦٥. ئەگەر هیچ ڕێگایەکت نەدۆزیەوە بۆ سەرکەوتن ئەوا خۆت ڕێگا بۆ سەرکەوتن دروست بکە .

٥٦٦.لەو کەسە داهێنەرانە مەبە کە هیچ شتێکیان دانەهێناوە جگە لە ﴿ قڕیان ﴾ نەبێت .

٥٦٧. ئەگەر بینیت گفتوگۆی نێوان دوو کەس زۆری خایاند ئەوا بزانە هەردوولا لەسەر هەڵەن چونکە بەڵگەی حەق کات بە ناهەق نادات درێژە بکێشێ .

٥٦٨. ئەو ڕێگایە نیشانی کەس مەدە کە خۆت ناوێری پێیدا بڕۆیت .

٥٦٩. سەربەرزی پێشەوا قازی محمد لەیاد مەکە کاتێ لەسەرە مەرگدا بۆ دوژمن ووتی : " ئێستا دەتوانن ببینن کە ئاستی پێڵاوەکانم لە ئاستی سەری ئێوەیە " .

٥٧٠. بۆ ئەوەی خۆشترین خواردن بخۆیت پاش برسیەتی خواردن بخۆ ، وە بۆ ئەوەی لە باشترین گەرەك نیشتەجێ بیت لە دڵی خەڵکان نیشتەجێ بە ، وە بۆ ئەوەی خۆشترین خەو بخەویت ویژدانت ئاسوودە کە .

٥٧١. بۆ ئەوەی قسە بکەیت دەبێ بێدەنگ بیت ، کە بێدەنگ بوویت ئەوسا دەزانیت کە دەتوانی بەبێدەنگی قسەبکەیت .

٥٧٢. بیرۆکەکانت وەك موگناتیس وان : ئەگەر بیرلە خۆشیەکان بکەیتەوە خۆشیت بۆ دێت وە ئەگەر بیر لە ناخۆشیەکان بکەیتەوە ناخۆشیەکان زووتر دێن .

٥٧٣. وریابە ئاژەڵەکان ترسناکن کاتێ کە برسی دەبن بەڵام مرۆڤەکان ترسناکترن کاتێ کە تێر دەبن .

٥٧٤. هەرکات کەسێك ووتی ئەم کارە ناتوانم ئەنجام بدەم بڵێ هەوڵدە بتوانی ، گەر ووتی نازانم بڵێ هەوڵدە فێربیت ، گەر ووتی مەحاڵە بڵێ هەوڵدە تاقیبکەیتەوە ...

٥٧٥. ئەگەر ئەوەی بەدەم دەیڵێیت ناتوانی بە کردەووە ئەنجامی بدەیت ، داخستنی دەمت خۆی لە خۆیدا کارێکی گەورەیە .

٥٧٦. وریای دڵەکان بە چونکە هیچ شتێك هێندەی دڵ بەهێز نیە بە شکاویش کاردەکات .

٥٧٧. ئەم چوار شتە لەم چوار شوێنە بپارێزە ﴿ دڵت لەکاتی نوێژ ، چاوت لەماڵی خەڵکی ، زوبانت لەناو خەڵکان ، گەدەت لەسەر خوان ﴾ .

٥٧٨. ئەو کەسانەی کە دەستی خەڵك ماچ دەکەن و ماستاویان بۆ ساز دەکەن ، شتێك لەدەست دەدەن کە خۆیان هەرگیز نرخی نازانن .

٥٧٩. ئەگەر ویستت من بناسیت وەرە خۆم بدوێنە ، لە ڕێگای زمانی خەڵکەوە من هەڵمەسەنگێنە .

٥٨٠. بە پێخواسی لە شەقام دا بڕۆ بەڵام بیر لە خودا بکەیتەوە زۆر باشترە لەوەی لە مزگەوت بیت و بیر لە پێڵاوەکانت بکەیتەوە .

٥٨١. هەتا ووشەی سەرزارت ﴿ الله أكبر ﴾ بێت ، نابێت هیچ شتێکت پێ گەورە بێت .

٥٨٢. مرۆڤ هەموو کاتێك گەورەیە تەنها ئەوکاتە بچووکە کە خۆی بە گەورە بزانێت .

٥٨٣. سەیرە ! جاران سەعات نەبوو هەموو کەس کاتی هەبوو کەچی ئەمڕۆ هەموو کەس سەعاتی هەیە و کەسیش کاتی نیە .

٥٨٤. ڕێزگرتن دەبێت لە ناخەوە بێت ، نەگینا ڕێزگرتن بە زۆر خۆی لە خۆیدا بێ ڕێزیە وە زۆر جار جوانترین ئەندازیار لە ژیان کەسێکە کە بتوانێ پردی عیبادەت لەسەر ڕووباری تاوان دروست بکات .



٥٨٥. هەرگیز باسی باوك و دایکت نەکەیت بۆ ئەو کەسانەی باوانیان نەماون ، وە هەرگیز باسی تەندروستی خۆت نەکەیت لای کەسی نەخۆش ، وە هەرگیز باسی هێزت نەکەیت بەرامبەر کەسانی لاواز ، وە هەرگیز باسی ئازادیت نەکەیت لای کەسی بەندکراو ، وە هەرگیز نەکەیت باسی منالّت بکەیت لای ئەو کەسەی کە منالّی نیە یان نایبێت یان هەیبووە لێی مردووە چونکە ئەم جۆرە کەسانە بەرگەی ئازار ناگرن .

٥٨٦. ئەگەر نەتوانی چاکە لەگەلّ هەموو کەسێکدا بکەیت ئەوا دەتوانی فێری چاکەیان بکەیت .

٥٨٧. بەداخەوە ئەوروپا زاناکانی وولاّتی ئێمەیان برد ، ئێمەش سۆزانی ئەوانمان هێناوە .

٥٨٨. داوا لە خودا بکە ئەو کات تەمەنت بوەستێنێ کاتێ لە خێر و داهێنان دەوەستیت .

٥٨٩. هەولّدە کەم ئامۆژگاری کەسەکان بکەیت زیاتر وایان لێبکە داوای ئامۆژگاری بکەن .

٥٩٠. وریای سیفەتی مرۆڤە سپلّەکان بە ، کاتێ سەد چاکەیان بۆ ئەنجام دەدەیت باسی ناکەن تەنها باسی ئەو کاتەت بۆ دەکەن کە کارەکەت بۆ ئەنجام نەداون .

٥٩١. راستی بلّێ و خەلّك بخەیتە گریان باشترە لەوەی درۆ بکەیت و خەلّك بخەیتە پێکەنین چونکە زۆرجار مرۆڤەکان هێندە بەوەستایی درۆ دەکەن پیاو پێی حەیفە باوەر نەکا .

٥٩٢. حوکم لەسەر کەس مەدە لەسەر بنەمای رابردووەکەی چونکە رابردووی ئەڵماسیش خەڵوزە .

٥٩٣. مەڵێ دونیا پشتی تێکردووم چونکە لەوانەیە تۆ بە پێچەوانە وەستا بیت .

٥٩٤. بۆ ئەوەی ببیت بە رۆشەنبیر لە هەر شتێك شتێك بزانە و لە بواری خۆشتدا هەموو شتێك بزانە .

٥٩٥. هەرگیز بە نادادپەروەری دونیا خەمبار مەبە چونکە هەموو جیاوازیەکانی دونیا بە مردن یەکسان دەبنەوە .

٥٩٦. هیوای هەموو جوڵەیەك وەستانە ، کۆتایی هەموو بوونێکیش نەمانە .

٥٩٧. ئەگەر خودا تەمەنی پێ دایت و نەوەکانی خۆت بینی ، پێیان بڵێ " رۆڵەکانم هەر کەسێك لە تەمەنی پاش داهێنان و سەرکەوتن بژی ئەوا تامی ڕاستەقینەی ژیانی وون کردووە " .

٥٩٨. وێنەگرتن مۆمیاکردنێکی مۆدێرنە بۆ مانەوە لە ژیان .

٥٩٩. خەیاڵ ئەو چانسەت پێ دەبەخشێ کە ژیان لێتی سەندووە .

٦٠٠. دوودڵترین کەس لە زیندان ( پاسەوانی زیدانە ) نەك زیندانەکە .

٦٠١. ئەو کارەی بە خێرایی ئەنجام دەدرێت لەوانەیە بە چاکی ئەنجام نەدرێت .

٦٠٢. دەم بەخەندەبە چونکە دەم بەخەندەیی ئەرکێکی کۆمەلأیەتی و سوننەتێکی ئایینیە .

٦٠٣. بۆ ئەوەی خەونەکانت بێتەدی لە خەوی غەفڵەت هەڵسەوە ، چونکە ئەو کەسەی خەونەکانتی بینیوە تەنها خۆت بوویت بۆیە چاوەڕێی کەسانی تر مەکە باوەڕ بە خەونەکانت بکەن تا بۆت بێننەدی ، بەمە بۆت دەردەکەوێت کە لە هەر ژیانێکی نوێ دا ئازارێکی نوێ هەیە ، وە لەدوای هەر ئازارێکیش ژیانەوەیەکی نوێتر هەیە ، بەمە بۆت دەردەکەوێت کە کەوتنی باران زیندووبوونەوەی ژیانێکی تر بە ئەرز دەبەخشێت .




٦٠٤. وەك ئەو کەسە مەبە کە فێری هەموو شتێك بوو لە ژیان جگە لەوە نەبێ کە چۆن بژێ چونکە هەرچەندە مرۆڤ عاقلتربێت هێندە کەمتر قسە دەکات .

٦٠٥. مرۆڤ لە گەردووندا خاوەن دڵێکی بچووکە بەڵام کە خۆشەویستی خوا ئەچێتە دڵیەوە لە گەردوون گەورەتر دەبێت .

٦٠٦. هەمیشە جوان سەیرکە و جوان بدوێ و جوان بیربکەرەوە بەڵام هەرگیز بە جوانی هەڵمەخەڵەتێ .

٦٠٧. هەوڵمەدە لە سروشتی ئەم سێ شتە تێ بگەیت :-

﴿ مۆسیقا ، وێنەکێشان ، ئافرەت ﴾ چونکە جیهانێکی ئاڵۆزن .

٦٠٨. لێ مەگەرێ بیرۆکە گەرمەکانت لە سەرما بمرێت .

٦٠٩. ئامادەکاری بکە بۆ مردن ، ئەگەر لە دەرگای دایت داوای گەڕانەوەی لێنەکەیت .

٦١٠. وانەزانی ئازایەتی لەوەدایە نەترسیت ، بەڵکو ئازایەتی لەوەدایە خەڵك هەست بە ترست نەکات .

٦١١. یــاســا دەبێت وەك مردن وابێت ، نابێ جیاوازی لە نێوان کەسەکاندا بکات .

٦١٢. هەڵەی گەورەی ئێمە ئەوەیە کە خۆمان بە هەڵەی کەسانیترەوە سەرقاڵ دەکەین هەر بۆیە تەمەنمان بێ بەرهەمە .

٦١٣. مرۆڤە مەزنەکان بە پێوەری خۆت مەپێوە ، بە پێوەری مرۆڤایەتی بیپێوە بۆ ئەوەی گەورەیی ئەوان و بچووکی خۆت بۆ دەرکەوێت .

٦١٤. ئاسانترین شت لام کارکردنە و قورسترین شتیش بیرکردنەوەیە .

٦١٥. ئەگەر ئامۆژگاری پیاوێکت کرد بە گوێچکێکی گوێ دەگرێت و لە گوێچکەکەی تری دێتە دەر ، بەڵام ئەگەر ئامۆژگاری ئافرەتێکت کرد بە هەردوو گوێچکی گوێ دەگرێ و لە زوبانی دێتەدەر .

٦١٦. ژیری ئەوەیە کە هەموو حەقێك لە کاتی خۆی و شوێنی خۆی و بۆ کەسی خۆی بدرکێنی .

٦١٧. ئەگەر میوانێکت هات تەلەفزیۆنەکەت بکوژێنەوە چونکە ئەو هاتۆتە لای تۆ نەك تەلەفزیۆن .

٦١٨. زۆرجار ئەو قسەی کە لێ دەترسای و بەگومان بوی لە ووتنی ، ئەو قسەیە یە کە دەبوایە بگوترێت ، وە هیچ مۆسیقایەکیش هێندەی بێ دەنگی ئاوازی خۆشی تێدا نیە.

٦١٩. خوا ئەو ووڵاتە سەردەخات کە دادوەرە و یەکسانی بەرقەراردەکات ئەگەرچی کافریش بێت وە ئەو ووڵاتە ژێر دەخات کە ستەمی لێ ئەنجام دەدرێت ئەگەرچی موسوڵمانیش بێت .

٦٢٠. خۆ سەرقاڵکردن بەکاتی رابردوو لە دەست دانی کاتی ئێستایە .

٦٢١. هەوڵدە مێژووی جولەکەکان بخوێنیتەوە تاکو بزانی کێ تیرۆرستە ؟! هەر لەبەر ئەوەشە تاکو ئێستا نەتەوە یەکگرتووەکان و رێکخراوی جیهانی بەناو مافی مرۆڤ نەیانتوانیوە پێناسەیەکی فەرمی ووشەی " تیرۆر " بکەن ، ئەمەیە فێرمان دەکات کە مرۆڤەکان لەهەر شتێك بترسێن رادەکەن لێی بەڵام ئەگەر لە خودای گەورە بترسێت پەنا دەبات بۆی .



٦٢٢. هیچ نەتەوەیەك هێندەی نەتەوەی ﴿ کورد و فەلەستین و یابان ﴾ شایستەی ڕێزلێنان نیە ، وە هیچ پیشەیەکیش هێندەی پێشمەرگایەتی و مامۆستا پیرۆز نیە .

٦٢٣. هەندێك هەڵەی ژیان وەك مین وایە ناتوانرێت لە جارێك زیاتر تاقیبکرێتەوە .

٦٢٤. مرۆڤە مەزنەکان بەوە بناسە کە لەسەرخۆ قسە دەکەن و بەخێراییش کاردەکەن .

٦٢٥. ئەگەر مردووەکان قسەیان بکردایە مێژوو پڕ نەدەبوو لە درۆ .

٦٢٦. مردن لە پێناو ﴿ خودا و خاك ﴾ ژیانە .

٦٢٧. ڕەنگ دانەوەی گوناهەکانت لە کاردانەوەی شتەکانی دەوروبەرتەوە ببینە بەرامبەر بە خۆت ، وە ئەگەر درکت بەمە نەکرد ئەوا بزانە عەقلی تۆ لە پشوی فەرمی دایە .

٦٢٨. خێرەکانت بشارەوە هەروەك هەروەك گوناهەکانت دەشاریتەوە .

٦٢٩. باوك و دایکی بەرێز : گرینگ نیە تۆ چەند متمانەت بە منداڵەکەتە ، گرینگ ئەوەیە ئەوان چەندە متمانەیان بە ئێوە هەیە کاتێك گرفتێك ڕوودەدات بە متمانەوە بۆت باس بکەن .

٦٣٠. ئەگەر لەگەڵ زانایەك کەوتیتە ئاخاوتن بەژیرانە قسەبکە بەڵام ئەگەر لەگەڵ نەزانێك کەوتیتە ئاخاوتن بەژیرانە بێ دەنگ بە .

٦٣١. وریای ئافرەتی خۆفرۆش بە چونکە لە غەریزەوە گرینگترین کەرستەی سیخوری ئەمنی وولاتە .

٦٣٢. بۆ ئەوەی رۆشەنبیری ڕەنگ بداتەوە رێگە بە رۆشەنبیر بدە دەنگی بیستراو بێت .

٦٣٣. نیوەی یەکەمی ژیانت بە بیرکردنەوەی لە نیوەی دووەمی ژیانت سەرقاڵ مەکە .

٦٣٤. کەس نابینیتەوە لە دونیا ڕاسگۆتر بێت ، رووی تێکەیت رووت تێدەکات پشتی تێکەیت پشتت تێدەکات .

٦٣٥. وریای شەیتان بە کاتێ دەستەوسان دەبێت بۆ هەڵکردنی فیتنەیەك هانا بۆ مرۆڤەکان دێنێ .

٦٣٦. با عەقلت لەسەرەوەی هەسارەکان بێت و جێگاشت ناو دڵی هاوەڵانت بێت و دڵیشت بۆ زیکری خوا بێت .

٦٣٧. بەهەشتی نەزانان دۆزەخی زانایانە ، دۆزەخی نەزانانیش بەهەشتی زانایانە .

٦٣٨. ئەگەر لە شوێنێك داهێنەر نەبوویت بزانە ئەمە شوێنی راستەقینەی تۆ نیە .

٦٣٩. کاتێ مرۆڤ داوا لە خوا دەکات خودای مەزن بە سێ شێوە وەڵامی دەداتەوە : دەڵێ بەڵێ ئەوەت پێ دەبەخشێ کە دەتەوێ ، دەڵێ نەخێر شتێکی باشترت پێ دەبەخشێ ، دەڵێ چاوەرێبە باشترینت پێ دەبەخشێ .

٦٤٠. گەر توانیت لە گشتی قورئان تێبگەیت ئەوا بزانە هیچ تێنەگەیشتوویت چونکە گەورەیی قورئان لەوە دایە کە ئەقلە گەورەکانیش تا کۆتایی زەمان گشتی تێناگەن .

٦٤١. گەر رۆژێکیان گەیشتیت بەوەی کە خودا چەندە مەزن و میهرەبانە ئەوا بزانە هیچ تێنەگەیشتوویت چونکە خودا ئەوەندە مەزنە و میهرەبانە کە لە مەزنی و میهرەبانی ئەو تێناگەین و لەبەر بچووکی ئەقلیشمان پێی ناگەین .

٦٤٢. ئەگەر زانیت بەهەشت چەند خۆشە ئەوا بزانە ئەوە بەهەشت نیە چونکە خۆشی بەهەشت لەوەدایە کە نازاندرێ چەندە خۆشە !!!



٦٤٣. ئەگەر تێگەیشتی کە گەورەیی خوا و مەزنی قورئان و خۆشی بەهەشت چەندە ؟ ئەوا بزانە کە هیچ تێنەگەیشتووی بەڵام ئەگەر تێگەیشتویت کە تا ئێستا لەبەر گەورەییانەوە تێنەگەیشتوویت ئەوا دڵنیابە کە تێگەیشتوویت !!! بۆیە ئەوە بزانە ناسینی کەسانی تر زانابیە بەڵام ناسینی خۆت رۆشناییە .

٦٤٤. تاکەی ئەم هاوکێشانە لەگەڵ تەمەنی مرۆڤ درێژ دەبنەوە ؟ هەوڵی سەرۆکەکان بۆ دەسەڵاتی فیرعەون ، ڕەنجی بازرگانانیش بۆ موڵکی قارون ، میللەتیش سەبری ئەیوب ؟! لە کاتێکدا فیرعەون و قارون نەمان و میللەتیش هەر زیندووە !!!

٦٤٥. لەو ساتەی تامی زانستم کردووە و کتێبم ناسیووە سێ شتم بیرچۆتەوە :-

﴿ دەست بەتاڵی و زۆرخواردن و زۆرخەوی ﴾ .

٦٤٦. شت گەلێکم موتالا کرد وام زانی لە پیتی یێم ، نیوەی تەمەنم بەسەر چوو ئێستا نازانم من لە کوێم ، تاکو لە گۆشەی خەوێکا زەریای زانستم بینی ، ئەوسا زانیم سەد ساڵ بژیم هێشتا بۆ ئەلفێك وا لە ڕێم ، بۆیە بەندەکەی خوا ووتی : خوای گیان ئەگەر چارەنووسی منت دیاری کردووە بۆچی دوعا بکەم ؟! خوداش فەرمووی ڕەنگە نوسیبێتم هەرچیەك بەندەکەم داوای بکات ! .

٦٤٧. کاتێ کە نامیلکەیەك دەنووسم و کۆتایی پێ دێنم هەست دەکەم کە بەشێك لە لەشم دەبڕێتەوە و کەم ئەندام دەبم ، بۆیە دەڵێم بەڵاْنسەکەم بریتیە لە ووتەکانم لەبەر ئەوەشە خۆم بە دەوڵەمەندترین کەس دەزانم .

٦٤٨. لەکاتی ووتاردان و قسەکردن وە بۆ گونجاندن و زووتر گەیاندنی پەیامەکان زمانی جەستە بەکاربێنە چونکە زمانی جەستە بە ڕێژەی ( ٥٥ ٪ ) کاریگەری بەسەر کەسی بەرامبەرەوە دەبێت وە گڕی دەنگ ( ٣٧ ٪ ) کاریگەری دەبێت وە ڕەوانبێژی قسەکانیشت ( ٨ ٪ ) کاریگەریا دەبێت .

٦٤٩. پێناسەی گەنج لای من دەبێ وابێ : گەنج ئەو کەسەیە کە بڕبڕەی پشتی کۆمەڵگەیە و بیرکردنەوەی جیاوازی پۆزەتیڤانەی بۆ ژیان هەیە و لە گشت کارەکانیدا دووربینە و ژیرە ، بۆیە گەنجێکی منالْ و ئەقل گەورەبە وە گەورە و دلْ منالاْنەش بە .

٦٥٠. دەزانی بۆچی ﴿ پەیکەری ئازادیان ﴾ لە ئەمریکا داناوە ؟ تاکو وولاْتەکانی تر تێبگەن کە پەیکەری داگیرکاری و مردوومکانیان تێدایە ! .

٦٥١. ئەو کەسەی دەڵێ من عاشقی کەسێك بووم و لەبیرم کرد ، درۆ دەکات عاشق نەبووە .

٦٥٢. چاکەکانی خەڵك بەرامبەر بە تۆ لەسەر بەرد بتاشە و چاکەکانی خۆشت بۆ ئەوان لەسەر سەهۆڵ .

٦٥٣. وەستانی مرۆڤ لەسەر دوو قاچەکەی بە پێچەوانەی گیانەوەران بۆ ئەوەیە کە سەیری ئاسمان بکات نەك ئەرز ، هەربۆیە هەرگیز لە ژیان ئاوات مەخوازە ﴿ تمنی ﴾ مەکە چونکە ﴿ وما أرسلنا من قبلك من رسول ولا نبي إلا إذا تمنى ألقى الشيطان في أمنيته ﴾ بەڵکو هەوڵدە و تەنها لە خودا داواکە چونکە ﴿ وإذا سألك عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان ﴾ لەمەوە فێردەبیت کە خودا تاکە پشتیوانە .

٦٥٤. سیاسەت مەدارەکانی جیهان وەك سپێرم وان ، تەنها لە ملیۆنێکیان یەکێکیان دەبێت بە مرۆڤ .



٦٥٥. یەکێك لە نیشانەکانی سەنگینی مرۆڤ ﴿ بێ دەنگی ﴾ یەتی ، وە یەکێك لە نیشانەکانی جوانی مرۆڤ ﴿ دەم بە خەندە ﴾ بوونیەتی ، کەواتە بێ دەنگ و دەم بە خەندە بە .

٦٥٦. جوانترین شت لە کاتی سوژدە بردندا ئەوەیە تۆ لە گوێچکەی زەویدا دەچرپێنیت و لەسەرەوەی ئاسمانەکانەوە گوێ بیستت دەبن .

٦٥٧. هەروەك چۆن پیشەی شوفێری ئەخلاقە ، جوان بەکارهێنانی ئەخلاقیش خۆی لە خۆیدا ئەخلاقە .

٦٥٨. دوورکەوە لەم کەسە و لەم وولاتەی کە ڕەوشت تێیدا نوێژی مردووی لەسەر کراوە چونکە کاتێ ویژدان دەمرێ پرسەی ماتەمینی گشتی ڕادەگەیەنرێت .

٦٥٩. خۆت بەکارێك خەریك مەکە کە ترسی چاوزاری لەسەر بێت بەڵکو خۆت بەوە خەریك کە کارێك بکەیت شایستەی ئیرەیی بردن بێت .

٦٦٠. زۆر مرۆڤم بینی کە جل و بەرگیان نەبوو ، زۆر جل و بەرگیشم بینی کە مرۆڤی تیا نەبوو .

٦٦١. خوشکی بەڕێزم : پۆشاکی ئافرەت لە ئابڕۆیەتی ، ئەگەر ئابڕوی چوو شەرمەفەمەندیشی دەچێت ئەگەرچی پۆشاکیشی لە ئاسن دروستکرا بێت .

٦٦٢. هەرگیز ئیرەیی بەو کەسانە مەبە کە بیرەوەریەکی بەهێزیان هەیە چونکە ئەوان خەمەکانیان درەنگتر لەیاد دەچێت .

٦٦٣. مەرج نیە هەموو ڕەنگێکی سپی دڵگیر بێت و هەموو ڕەنگێکی ڕەشیش بێزارکەر بێت ، ئەوەتا کفن سپیە و خەم هێنەرە ، بەرگی کەعبەی پیرۆزیش ڕەشە و دڵخۆشکەرە .

٦٦٤. ئێمە وەك پێنووسە ڕەنگا و ڕەنگەکانین ، لەوانەیە من ئەم ڕەنگە نەبم کە تۆ پەسندی دەکەیت بەڵام ئەوەت لەیاد بێت کە جوانی تابلۆی ژیان تەواو نابێت ئەگەر جیاوازی ڕەنگەکانی تێدا نەبینرێت .

٦٦٥. ژیر ئەو کەسەیە کە سوود لە دوژمن و هەڵەکانی ژیانی خۆی وەردەگرێت بەڵام لەو ژیر تر ئەو کەسەیە کە سوود لە هەڵەکانی کەسانی تریش وەردەگرێت ، وە گەوج ئەو کەسەیە کە دوارۆژی بە دونیای بگۆڕێتەوە بەڵام لەو گەوجتر ئەو کەسەیە کە دوارۆژی خۆی بە دونیای کەسێکیتر بگۆڕێتەوە .

٦٦٦. هەرگیز ئاوڕ لە رابردووت مەدەوە مەگەر بەو ئەندازە نەبێت کە وەك ئەزموونێك سوودی لێ وەرگریت بۆ داهاتوو ، وە هەرگیز چاوەڕێی داهاتووت مەکە چونکە خۆی بەم زووانە دەگات .

٦٦٧. سەیرە پیاو خەون بە ئافرەتێکی کامڵ دەبینێت و ئافرەتیش بەهەمان شێوە خەون بە پیاوێکی کامڵ دەبینێت کەچی هەردوو لا ئەوەیان لەیاد چوو تەواوکەری یەکترن .

٦٦٨. سەیر نەبێ لات کە لەم ژینەدا زۆر خەڵکی هەژار هەن خاوەنی هیچ شتێك نین جگە لە پارە نەبێت ، لەمەوە فێردەبیت کە هەندێ جار پێویستە بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ پرسیار بە پرسیارکردن وەڵام بدەیتەوە ! بۆ نمونە کەسێك دەپرسێ بەچی دەیسەلمێنی کە خودا بوونی هەیە ؟ تۆش بڵێ بەچی دەیسەلمێنی کە بوونی نیە ؟! چونکە بوونی ئەو ( کەسی پرسیارکەر ) لە مولکی ئەودا ( خودا ) دا بەڵگەیە لەسەر بوونی ئەو کە خودایە ( سبحانە و تعالی ) .



٦٦٩. ئەگەر سەرنەکەوتی لە پێکانی ئامانجەکانت لە ژیان ، شێوازی ڕێگاکانت بگۆڕە نەك پرێنسیپەکانت چونکە درەختەکان بۆ نوێ بوونەوە گەڵاکانیان دەگۆڕن نەك ڕەگ و ریشەیان .

٦٧٠. ئەگەر پێیان ووتیت هیچ مەنووسە کاتێك تورەیت چونکە قسەکانت لەکاتی تورەبووندا بە ئازارە ، تۆش پێیان بڵێ ئەگەر هەستتان بە ئازاری ووشەکانم بکردایە تورەتان نەدەکردم .

٦٧١. مەهێڵە کەشتی ژیانت بوەستێ لەبەر ئەوەی سەهۆڵی خەم ڕێگەی گرتوویت چونکە کاتێ کاتژمێر دەوەستێ کات هەرگیز ناوەستێ .

٦٧٢. دڵخۆش مەبە بەوەی کە بە ئەندازەی مووی سەرت هاورێت هەیە چونکە ئەو کاتەی پێویستیت پێیان دەبێت ئەوسا هەست دەکەیت کەچەڵیت .

٦٧٣. تێروانین و بیرکردنەوەی تۆ بۆ دەوروبەرت کەسایەتیت نیشان دەدات ، سەیرکە کاتێ سێوێك کەوتە خوار ئیسحاق نیوتن هێزی کێش کردنی زەوی دۆزیەوە ، وەکاتێ دایکی ستیڤن جۆبس کورێکی بە سێوێك پەروەردەکــرد لە ئەنجـام کـۆمپانیای مەزنی ﴿ ئەپڵ ﴾ ی پێ بەرهەم هێنا ، کەچی ئێمە نەمانتوانی سوود لە سێو وەرگرین جگە لە بەکارهێنانی نەبێت بۆ نێرگلە !!! .

٦٧٤. لە خاك و نیشتیمانێكدا كە سێبەری كەسە بچووكەكان گەورەكرا ئەوا بزانە لەو نیشتیمانە خۆر لە ئاوا بووندایە .

٦٧٥. ژیان وەك چایەكی تاڵە ، كردەوە جوانەكانیش شەكرە ، كەوچكی چایەكەش بەدەست خۆتەوەیە و تۆی بڕیار دەدەیت كە بە تاڵی دەیهێڵیتەوە یان شیرینی دەكەیت .

٦٧٦. ووریابە ! كەرێكت پێ ماچ كەن باشترە لەوەی بە ماچێك كەرت كەن .

٦٧٧. دەزانی بۆچی ئاو موسای لەناو نەبرد ؟ بۆچی ئاگر ئیبراهیمی نەسووتاند ؟ بۆچی چەقۆ سەری ئیسماعیلی نەبڕی ؟ بۆچی نەهەنگ یونسی نەخوارد ؟ بۆچی و بۆچی ؟؟؟ چونكە هەموو ئەمانە پشتیان بە خوا بەستبوو بۆیە ووشەی ترس لە فەرهەنگی ئەوان دا بوونی نەبوو .

٦٧٨. نیگەرانی وەك جۆلانەیە هەردەم دەتهێنێ و دەتبا بەلام هەرگیز بەرەو پێشت نابات .

٦٧٩. ژیان لە پێناوی خودا قورسترە لە مردن لە پێناوی دا .

٦٨٠. رۆشەنبیری بەمانای خوێندنەوە و نووسین و ئامادەبوون لە كۆڕ و شانۆكان نایەت بەلكو رۆشەنبیری : خود ئاگاییە و هۆشیاریە كە وا لە مرۆڤ دەكات بزانێت كۆمەلگەی مرۆیی و كۆمەلگەكەی خۆشی لە چ بارودۆخێك و لە چ قۆناغێكی مێژوویی دایە ، وە ئەركی ئەم تاكە لەم كاتەدا بەرامبەر بە خۆی و دەوروبەرەكەی چیە ؟ دەبێ چی بكات و بەرەو كێی بەرێت ؟ بەمە ئیتر دەكرێ مرۆڤ رۆشەنبیربێت و نەخوێنەوار بێت لەهەمان كاتدا .

٦٨١. زۆر نزاكە و دەست بەرزكەو بڵێ خوایە گیان من هەر عەبدەكەی تۆم لێم ببورە جارجار سەرەرۆم .

٦٨٢. ئەگەر ویستت شتێك بشاریتەوە بیخە ناو كتێبێكەوە چونكە میللەتی ئێمە كەسانێكن كتێب ناخوێننەوە تا بیكەنەوە ، وە ئەو كەسەی كە دەڵێت من ناتوانم بڕیار بدەم ئەوا ئەو كەسە لەناخی خۆیدا بڕیاری داوە كە بڕیار نەدات و بێ ئیرادە بێت .




٦٨٣. بەداخەوە ... درۆیەك ئەتوانێت بەینی دووکەس لەناوبەرێت بەلاَم بە دووکەسان ناتوانن درۆیەك لەناوبەرن .

٦٨٤. بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت لە ژیان پێویستیت بە دوو یاسایە : یەکەم ، زۆرکات لە ژیان خۆت گەوج کەیت کە گوێ بیستی هەندێ شت نەبوویت . دووەم ، هەردەم متمانەت بەخۆت بێت و کەسایەتیت لەدەست نەدەیت .

٦٨٥. ئەو کاتەی تێری بە دەنگی بەرز قاقا مەکە چونکە کەسانێك هەن لە برسا توانای گریانیان نیە .

٦٨٦. ئەوەی کە لە دڵتدایە هەمووی مەڵێ نەوەك ڕۆژێ بۆ ووشەیەك لاڵ بمێنی ، وە ئەوەی کە لە دەستتدایە بەجارێ مەیبەخشە نەوەك ڕۆژێ بەدەست بەتاڵی بمێنی .

٦٨٧. باوەشکردن بەم دوونیایە هەڵە کردنە ، چونکە ئەم دوونیایە فلیمێکە دوایین ئەڵقەی هەر مردنە .

٦٨٨. جوانی نەمام لە سروشتی دا نیە هێندەی ئەوەی جوانی لە سادەیی دایە کە ئەگەر تێنووبێت هاوار ناکات چاوەرێ دەبێت ئاو بدرێت ئەگینا بە هێمنی دەمرێت .

٦٨٩. یەکێك لە کۆنترین ووشەکانی سەر رووی زەمین بریتیە لە ﴿ بەڵێ و نەخێر ﴾ هەر ئەم دووەشن زۆرترین کاتیان پێویستە بۆ بیرکردنەوە پێش ووتنیان .

٦٩٠. " نەفس " تا تێری کەیت زیاتر برسیە ، " مێشك " تا پری کەیت زیاتر هزریە .

٦٩١. هیچ شتێك لەم ژینەدا بەتەواوی هەڵە نیە ، تەنانەت کاتژمێری وەستاویش لە ڕۆژێکدا دووجاران ڕاست دەکات .

٦٩٢. زۆر دیاری ببەخشە ، تەنانەت گوڵ فرۆشیش دڵی خۆش دەبێت کاتێك گوڵێکی بە دیاری پێ دەبەخشرێت .

٦٩٣. سەیرکە خودای مەزن ﴿ نەمرودی بە مێشووله ﴾ لە ناوبرد وە ﴿ فیرعەونی بە ئاو لەناو برد ﴾ وە ﴿ چیرۆکی ئەحزابی بە بـا لەناو برد ﴾ وە ﴿ ئەتاتۆرکی بە مێرووی سوور ﴾ لەناو برد  وە ﴿ هێتلەریش بە خۆکوشتن ﴾ وە ﴿ ئەبرەها بە بەرد ﴾ وە ﴿قارون بە ڕۆچوونی زەوی ﴾ ئەمانە بۆ ئەوەن کە بزانیت خوا شتە گەورەکان بە شتە بچووکەکان لەناو دەبات چونکە لای ئێمە گەورەن لای ئەو بچووکە .

٦٩٤. ئەو مرۆڤەی بێ دەنگە زۆر جوانە بەتایبەتی ئەو کاتەی کە قسە دەکات قسەکەران بێدەنگ دەکات .

٦٩٥. هەرکات هەڵبژاردنی پەرلەمان هات ئەم ئامۆژگاریەت لەیاد بێت ﴿ پێش ئەوەی دەنگ بە هەر لیستێك و حیزبێك و لایەنێك بدەیت بزانە دەنگ بە چ کەسێك دەدەیت وە پێش ئەوەی دەنگ بە هەر کەسایەتیەکی حزبێك و لایەنێك و پارتێك بدەیت دەنگ بە کردەوەکانی بدە و بزانە چی چاندووە تا بۆ من و تۆ دروێنەی بکات چونکە دەنگی تۆ = نرخی تۆ = ئایندەی نەوەکەت ﴾ بۆیە لە هەڵبژاردندا گرینگ نیە کێ دەنگ دەدات ، گرینگ ئەوەیە کێ دەنگەکان ئەژمێردەکات چونکە گەندەڵی بە دزینی دەنگی خەڵك دەست پێ دەکات بە دزینی خەونەکانیشیان کۆتایی دێت .

٦٩٦. خۆم بەچاوی خۆم بینیم بازاری کۆیلە فرۆشی هێشتا ماوە ، تەنها جیاوازی کۆیلەی ئەم سەردەمە لەگەڵ کۆیلەکانی پێشوو ئەوەیە کە جاران گەورەکان کۆیلەکانیان هەڵدەبژارد کەچی ئێستا کۆیلەکان گەورەکانی خۆیان هەڵدەبژێرن ، وە کۆتاماڵیش بۆ ئێمە ئیتر هەر قەبرە جا ئەگەر تۆ مردنت لەبیرنیە دڵنیابە مردن تۆی لەبیرە .



٦٩٧. پیرۆزی کرێکار لە ئیسلامدا لەو ئاستەیە کە دەزانین پێغەمبەری خۆشەویست جگە لەم دوو دەستە دەستی کەسی ماچ نەکردووە : دەستی کرێکار ( سعد بن معاذ ) و دەستی ئافرەت ( فاطیمة ) ئەم دووچینەی لە هەموو رژێمەکان و شارستانیەتێکدا چەوساوە بوون جگە لە سایەی ئیسلام نەبێت .

٦٩٨. هەرکات ئافرەت جوانی فیکری و بیرکردنەوەی خۆی دۆزیەوە و لێی تێگەیشت ئەوکات جوانی جەستەی هەرگیز دەرناخات .

٦٩٩. هەرکەس خاوەنی ئەدەب و ئەخلاقێکی بەرز بێت بۆ هەتا هەتایی لەناو دڵەکان دەمێنێتەوە .

٧٠٠. گەورەترین هەڵە لە ژیانی مرۆڤ ئەوەیە کاتێ هەڵە دەکات و هیچ وانەیەك لە هەڵەکەی فێرنابێت .

٧٠١. ئەگەر چەکوش تاکە شت بێت لەو شتانەی کە بەکاری دێنین بە مەرجێك بزانی لە کوێی دەدەیت ، ئەوا هەموو شتەکانی دەوروبەرت دەبن بە بزمار بۆت .

٧٠٢. هەرگیز وانەزانی دونیا بەو کەسانە خراپ دەبێت کە خراپە دەکەن ، بەڵکو بەو کەسانە خراپ دەبێت کە خراپە قبوڵ دەکەن .

٧٠٣. نەکەیت زیاتر لە حەقی خۆی شت بەکەسەکان ببەخشی چونکە زۆرجار گوڵ دەمرێت کاتێ زیاتر لە ئەندازەی خۆی ئاوی پێ دەدرێت .

٧٠٤. ئەگەر وتیان بەیانی هەموو شتێك باش دەبێت ، بڵێ مەگەر ئەمڕۆ بەیانی دوێنێ نەبوو ؟! .

٧٠٥. سەیرە ، خەڵك بۆ پارە شێت ئەبێت کەچی شێتەکانیش بێ پارەن ! .

٧٠٦. پێویست ناکات بۆ ئازادی ئەرز و ئاسمان بکرین ، تەنها خۆمان نەفرۆشین بەسە ! چونکە ئەگەر لە ئاسمانەوە ئازادی ببارێت ئەوانەی حەزیان لە کۆیلایەتی بێت یەکسەر چەتر هەڵدەدەن .

٧٠٧. هەوڵدە لەکاتی توڕەبووندا دەستت بخەیتە ناو گیرفانتەوە ، ئەگەر لە وەستان بوویت دانیشە ، ئەگەر لە دانیشتن بوویت پاڵ کەوە ، ئەگەر لە پاڵکەوتن بوویت هەستەوە و دەست نوێژێك بشۆ و دوورکاعەت نوێژ بکە ئاگری تورەییت دەکوژێتەوە ، وە کاتێ کەسێك لێت توڕە دەبێت هەوڵدە سەیری ناو چاوانی نەکەیت چونکە ئەمە زیاتر توڕەی دەکات .

٧٠٨. هەڵەی دکتۆر مرۆڤ لە ژێر خاك دەنێت ، وە هەڵەی ئەندازیار خاك بەسەر مرۆڤ دەنێت ، بەلاَم هەڵەی مامۆستایەك نەوەیەك بە زیندوویی جینۆساید دەکات .

٧٠٩. ئەدەب وەسفێکە هەر بۆ مەرد ئەشێ ، نامەرد ئەدەبی قەت لێ ناوەشێ ، دووربە لەو کەسەی لە ئەدەب دوورە ، ماڵی بێ ئەدەب ماڵی بێ نوورە .

٧١٠. گرینگی تایبەت بە پاك ڕاگرتنی ژینگەی دەوروبەرت بدە چونکە پاك و خاوێنی شارەکەت لە ماڵەکەتەوە دەست پێ دەکات .

٧١١. خوشکی بەرێزم پێش ئەوەی ببیت بەو کچەی پێویستی بە پیاوە ببە بەو کچەی کە پیاو پێویستی پێیەتی ، وە ڕەوشت بەرزبە جوان دەبیت چونکە هەموو ڕەوشت بەرزێك جوانە بەلاَم هەموو جوانێك ڕەوشت بەرز نیە .




٧١٢. هەرچەندە مۆدێلی جل و بەرگ و مۆدە و فاشیۆنی ئافرەتان بگاتە لووتکە ناگات بە جوانی شەرم و بە ئابرۆیی بۆ ئافرەت ، چونکە هەموو رەوشت بەرزێك جوانە بەلام هەموو جوانێك رەوشت بەرزنیە .

٧١٣. ئەگەر هیچ شتێك لە نیشانەکانی هاتووچۆ نازانیت ئەوا ئەم دوو نیشانە بزانە بەسە ﴿ هەموو نیشانەیەکی سووری سێگۆشە واتای ئاگاداریە ، وە هەموو نیشانەیەکی سووری بازنەیش واتای قەدەغەکردنە ﴾ رەنگ شینەکانیش بۆ زانیاریە .

٧١٤. وریای ئەو کەسانە بە کە بەردیان لە سینەدا هەلگرتووە و ناویان ناوە " دڵ " .

٧١٥. ئەو کات دوژمن دەتوانێ تێکت بشکێنێ کاتێ کە توانی ورەت دابەزێنێ .

٧١٦. ئەگەر کەسێکی خۆشەویست خیانەتی لێکردیت ﴿ سەگێکی ﴾ بۆ بکرە تا فێری واتای بە وەفایی و خۆشەویستی بکات .

٧١٧. زۆر جار لەسەرتە وەك " صابوون " بیت لەگەڵ هەموو پیسی و چڵکیەك مامەڵەبکەیت تاوەکو پیسی لەناو ببەیت هەرچەندە خۆشت دەتوێیتەوە ، وە هەروەها زۆرجاریش پێویستە وەك مۆم بیت تەنها بۆ ئەوەی رووناکی ببەخشیت دەبێ بتوێیتەوە .

٧١٨. ئەگەر تووشی کێشەیەك بوویت لە دەسەڵاتی تۆ دا نەبوو ئەوا ئەم سێ خاڵەت لەیاد بێت : ﴿ ئەم کێشەیە کاتیە و دەبڕێتەوە ، وە ویستی خوای لەسەر بووە بۆیە روویداوە وە پاداشتت پێ دەبەخشێ ئەگەر ئارام بگریت و سوپاس گوزاری خوا بیت بەوەی کە ئەو لە تۆ زاناتر و بەخشندەترە ﴾ .

٧١٩. سەیر نەبێت لات ئەگەر بۆقێکت لەسەر کورسی زێرین دانا تا رێزی لێبگریت پاشان پازیدا بۆناو گۆمێك ، چونکە هەندێك لە مرۆڤەکان وان کاتێك رێزیان لێدەگریت و بەرزیان دەکەیەوە خۆیان خۆیان نزم دەکەنەوە .

٧٢٠. هەوڵدە لە ژیان وەك هێرشبەر بیت لەناو یاریگادا کە هەردەم لەدوای ئامانج بگەڕێیت نەك وەك ناوبژیوان بیت لەدوای هەڵەی خەڵکان بگەڕێیت .

٧٢١. هەرکات ویستت مناڵەکانت زیرەك بن چیرۆکی ئەفسوناوی زانستیان بۆ بخوێنەرەوە ، وە ئەگەر ویستت زیاتر زیرەك بن زیاتریان بۆ بخوێنەرەوە .

٧٢٢. پێش ئەنجامدانی هەموو کارێك پشت بە خوا ببەستە بەڵام لەکاتی خوێندن دا ئەرکەکەت بە تێگەیشتنەوە بخوێنە ئینجا دووبارە پشت بەخوا ببەستە چونکە خوا نا فەرمێ ﴿ باسم ربك الذي خلق اقرأ ﴾ بەڵکو دەفەرمێ ﴿ اقرأ باسم ربك الذي خلق ﴾ سەرەتا خوێندنی پێش خستووە بۆئەوەی سەرەتا هەوڵ دەیت پاشان پشت بەخوا ببەستی .

٧٢٣. پێش ئەوەی ڕەخنە لە کەسێك بگریت و ئامۆژگاری بکەیت سەرەتا باسی شتە باشەکانی بکە پاشان ئامۆژگاریەکەی بکە و لە کۆتاییشدا پێی بڵێ ئەوە خۆشەویستی من بوو بۆ تۆ کە نەمتوانی بەرگە بگرم باسی هاورێیەکم بکرێت هەڵە بکات و من رێگای نیشان نەدەم هیوادارم تۆش هەرکات بینیت من هەڵە دەکەم بەم شێوەیە ئامۆژگاریم کەیت چونکە هەمووومان ئاوێنەی یەکترین .



٧٢٤. بیرت بێت مرۆڤ نیە ئەو کەسەی کەسێکی لەپێش دەچەوسێنرێت و هەست بە چەوساوەیی خۆی ناکات .

٧٢٥. وورپای سنووری خۆت بە چونکە ئازادی تۆ لەو شوێنە تەواو دەبێت کاتێك ئازادی کەسێکیتر لەوێوە دەست پێدەکات .

٧٢٦. بەو کەسانە نیگەران مەبە کە باسی تۆ بە خراپە دەکەن چونکە ئاوێنەی شکاو وێنە جوانەکانیش بە ناشرینی پیشان دەدات .

٧٢٧. هەرکات ویستت لەگەڵ خودا ئاخاوتن بکەیت ئەوا نوێژ بکە ، بەڵام هەرکات ویستت خوا ئاخاوتنت لەگەڵدا بکات ئەوا قورئان بخوێنە چونکە قورئان هێندە ئاسانە منالیش تێی دەگات وە هێندە قوڵیشە زاناش تێی نەگات .

٧٢٨. هەرگیز داوای خۆشەویستی لە هیچ ئافرەتێك مەکە بەڵکو هەوڵدە خۆشتی بوێت .

٧٢٩. ئەگەر تۆ لەو کەسانەیت کە هیچ شتێك بەبێ بوونی رووناکی نابینیت و هیچ شتێکیش بەبێ بوونی سەرچاوەی دەنگ نابیستی ئەوا لە ڕاستیدا تۆ نەدەبینی و نەدەبیستی .

٧٣٠. بێدەنگی و سەنگینی هەندێ مزگەوت خۆشتر و باشترە لە ووتاردانی هەندێ مامۆستای بە ناو ئاینی تیایدا .

٧٣١. هەرکات چاکەیەکت لەگەڵ کەسێکدا کرد وریابە باسی نەکەیت ، وە ئەگەر یەکێك چاکەیەکی لەگەڵ دا کردی وریابە لەیادی نەکەیت .

٧٣٢. هەرگیز ﴿ تـف ﴾ لە رووی قیبلەدا مەکە ، وە پێش ئەوەی بچیت بۆ سـەرئـاو یان ﴿ ئاودەست ﴾ ئەم دوعایە بکە و بڵێ ﴿ اللهم إني أعوذبك من الخبث والخبائث ﴾ وە بەپێی چەپ برۆ ژوورەوە پاشان بەشێوەیەکی وا دانیشە کە نەرووت نە پشتت بکەوێتە قیبلەوە و لە ژوورەوەدا هیچ قسەیەك مەکە تا دێیتە دەرەوە وە بەپێی ڕاست وەرە دەرەوە و بڵێ ﴿ اللهم غفرانك ﴾ .

٧٣٣. وەك ئاو بە ڕەنگی ڕاستەقینەی خۆت مەشێوێنە ، خەسڵەتی خۆی لەدەست نادات چ لەناو کوپی قوڕ بکرێت یان زێڕ بەڵکو خۆی لەگەڵ هەموو شکڵەکان دەگونجێنێ بێ ئەوەی تام و ڕەنگ و بۆنی سروشتی خۆی لەدەست بدات .

٧٣٤. هەرگیز نزا لە خوا مەکە ئارامیت پێ ببەخشێت چونکە ئارامگرتن لەسەر بەلآ و نەهامەتی دێت بەڵکو هەردەم داوای خۆشی بکە پێتی ببەخشێت .

٧٣٥. ئەگەر باڵآت کورتە لەچاو کەسانی ئاسایی ئەوا لەگەڵ پانتۆڵەکەتدا قەمیسێکی خەت خەت ﴿ مخطط ﴾ لەبەربکە وە ئەگەر باڵآت لەچاو کەسانی ئاسایی درێژترە ئەوا لەگەڵ پانتۆڵەکەتدا قەمیسێکی چوارگۆشە ﴿ مربعات ﴾ لەبەربکە وە ئەگەر باڵآشت ئاساییە قەمیسی ڕەنگ سادە لەبەرکە ، بەمە ڕوخسارت جوانتر دەبێت .

٧٣٦. ڕێز لە جەنازە بگرە و هەستەوە لەبەری دا ئەگەرچی هی جولەکەش بێت .

٧٣٧. وا قورئان بخوێنە کە گشت ئایەتەکانی بۆ تۆ و لەسەر تۆ دابەزیوە نەك بۆ کەسانی تر ، وە کاتێ ئەو ئایەتانە دەخوێنیت کە باس لەوە دەکەن خوا منداڵی هەیە و فریشتەکان کچی ئەون و عیسا کوڕی ئەوە ﴿ نستغفرالله ﴾ ئەوا لەم جۆرە ئایەتانەدا دەنگت نزم کە ، وە لەو ئایەتانەی باسی گەورەیی و میهرەبانی خوا دەکات دەنگت کەمێك زیاتر بەرزکە .



٧٣٨. ئەگەر لەگەڵ کەسێك دانووسانت کرد هەوڵدە سەرەتا ئەوان مەرجەکانی خۆیان بڵێن تۆش کۆتایەمین کەس بیت مەرجی خۆت بسەپێنیت بەمە شتی زیاترت بۆ روون دەبێتەوە .

٧٣٩. خەنە ﴿ حنـاء ﴾ زۆر بەکاربێنە بەتایبەتی بۆ ریش و دەست و لاق و سەرت چونکە پێست و موو بەهێز دەکات و لۆچی کەم دەکات ، وە ﴿ کل ﴾ی چاوانیش زۆر بەکار بێنە سپێنەی چاو جوان دەکات ، وە خواردنی ﴿ دۆمبەلانیش ﴾ چاو بە هێز دەکات .

٧٤٠. کاتێك ﴿ معاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ﴾ توڕەبوو بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامەتی کەشتی سەربازی بەکارهێنا و دژی رۆمەکان وەستا ، وە کاتێك خەلیفە ﴿ معتصم باللە ﴾ توڕەبوو شاری ( عەموریە ) ی رزگارکرد کە گەورەترین زیندانی بێزەنتینیەکان بوو ، وە کاتێك ﴿ صلاح الدین ئەیوبی ﴾ توڕەبوو سوێندی خوارد کە هەرگیز پێنەکەنێ تاکو ( قودس ) بۆ موسوڵمانان نەگەڕێنێتەوە ، وە کاتێك ﴿ محمد فاتح ﴾ توڕەبوو شاری ( ئیستەنبوڵ ) ی رزگارکرد کە گەورەترین زیندانی رۆمەکان بوو ، وە کاتێك ﴿ عبدالرحمانی غافیقی ﴾ توڕەبوو هێزی سەربازی موسوڵمانانی گەیاندە ناوجەرگەی ( پاریس ) بەڵام کاتێ هەندێك لە دەسەڵاتدارە بێ دەسەڵاتەکانی ئێمە توڕەدەبن راستەوخۆ نامەی نارەزایی بۆ نەتەوە یەکگرتوەکان بەرزدەکەنەوە !!!

٧٤١. زانست لەو کەسە وەرمەگرە کە خۆی چی پێ نەبێت بیبەخشێت ، وە زانست بە کەسێك مەدە کە زانیت نازانێت بە شیاوی بەکاری بێنێت چونکە بەخشینی زانست بەکەسانی شیاو خۆی لە خۆیدا زانستە .

٧٤٢. ناخۆشرین شت ئەوەیە کە تۆ شتێك بە خەمباری بنووسیت و خەڵك بە گاڵتە و پێکەنینەوە بیخوێنێتەوە ، بۆیە دڵت فراوان بکە و بیرخۆت بێنەوە کە سەگ هەر چی بکات ناتوانێت بزەرێت .

٧٤٣. ئەگەر خەمباربوویت سورەتی ﴿ یوسف ﴾ بخوێنە ، وە ئەگەر بیرەوەریت لاواز بووە سورەتی ﴿ یس ﴾ زۆر بخوێنە ، وە ئەگەر بێ هێزیت قورئان بخوێنە .

٧٤٤. گەورەترین بڕوانامەی مرۆڤ لە ژیاندا ﴿ ڕەوشتە ﴾ کە هەموو کەس ناتوانێت بەدەستی بهێنێت .

٧٤٥. وریابە هەمیشە مردن بە گوێچکەتەوە دەچرپێنی و دەڵێ وریابە من لە ڕێگادام بۆ تۆ بۆیە لەم ساتەوە ئامادەکاری بۆ کۆتا سەفەرت بکە .

٧٤٦. هەموو شتێك شایەنی تاقیکردنەوەیە تەنها هەستی خەڵك نەبێت .

٧٤٧. بیرت بێت ئێمە میللەتێکین ئەگەر هاتوو ئەرز بۆمان تەسك بێت ئاسمان بۆمان فراوان دەبێت ، پشت بەخوا ببەستە هەموو شتێك بەدڵی تۆ دەبێت .

٧٤٨. تێناگەم بۆچی ئەگەر سەرتاش هەڵە بکات دەڵێن مۆدێلێکی تازەیە ، وە ئەگەر زانایەك هەڵەکات دەڵێن شتێکی تازە دۆزرایەوە ، وە ئەگەر مامۆستایەك هەڵەکات دەڵێت ویستم تاقیتان بکەمەوە ، کەچی ئەگەر قوتابیەك هەڵەی کرد دەڵێن بەداخەوە "دەرنەچوو" .

٧٤٩. هەرکات ئەقلی زانایەك بپشکنن هاوردەی دەکەن چونکە ئەو زۆر لەوە زاناتر و گەورەترە کە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە ، وە زۆر لەوەش نەزانتر و بچووکترە کە خۆی بیری لێ دەکاتەوە ، هەر بۆیە جارێکیان بەرپرسێکی دزمان ڕادەستی پۆلیس کرد کەچی خۆمان دادگایی کراین بەتۆمەتی ئەوەس سوکایەتیمان بە ڕەمزی وولات کرد !



٧٥٠. ئاگاداری ئەوەبە کە پیاو هەموو کاتێك پیاو نیە ، بەڵام ئافرەت هەموو کات ئافرەتە ، وە ئافرەتانن پیاو دروست دەکەن ، پیاوانیش جیهان دروست دەکەن .

٧٥١. هەرکەس خێرو چاکەی بۆ خەڵك بوێت ئەوا خێرو چاکەی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە .

٧٥٢. ئەوەی دوێنێی خۆی لەبیر بچێت ، ناتوانێت نەخشە بۆ بەیانی خۆی بکێشێت .

٧٥٣. دوورکەوە لەو مرۆڤانەی لە تەنیایی دا دەژین چونکە لە بری بنیاتنانی پرد بۆ پەڕینەوە هەمیشە دیوار بنیات دەنێن بۆ خۆشاردنەوە .

٧٥٤. هەرگیز هەوڵمەدە فێڵ لەکەس بکەیت بەڵکو هەوڵدە فێڵ لە فێڵ بکەیت ، بەو واتایەی ئەگەر کەسێك فێڵی لێ کردیت هەوڵدە فێڵکردنی ئەو پوچەڵ بکەیتەوە بەمە دەتوانی فێڵ لە فێڵ بکەیت نەك فێڵ بکەیت .

٧٥٥. هەوڵی چاك کردنی هەموو شتێك مەدە چونکە خراپ دەبێت ، وە ئەگەر کەسانی خراپ نەبن جوانی کەسە باشەکان دەرناکەوێت .

٧٥٦. خودای گەورە دەفەرمووێت : ئەی ئادەمیزاد داوای رزق و رۆزی بەیانیم لێ مەکە چونکە من ئەو کەسەم لەیاد نەکردووە کە پشتی تێکردووم چۆن کەسێك لە یاد دەکەم کە رووی تێکردووم !!! .

٧٥٧. زۆر ووریای زوبانت بە ڕاستە زمان ئێسکی نیە بەڵام ئێسك دەشکێنێت .

٧٥٨. دایك و باوکی خۆشەویست منداڵەکەت زۆر ماچ بکە با سۆزی هەبێت ئەگەر نا عەشقی ماچی حەرام دەبێت .

٧٥٩. گەورەترین دیاری کە باوك پێشکەش بە منالەکانی بکات ڕێزگرتنی دایکیانە .

٧٦٠. وامەزانە زۆر قسەکردن لە بارەی هەنگوینەوە شیرنی بەدەمی مرۆڤ دەبەخشێ ، کەم بدوێ و زۆر گوێبگرە و زیاتر بیرکەوە .

٧٦١. کاتێك پەڕی چۆلەکەیەك لێدەکەیتەوە واتای ئەوە نیە لە باڵی دەکەیت ، بەڵکو ئاسمانێکی پان و بەرینی لێ دەسەنیتەوە .

٧٦٢. باوکی بەساڵاچوو کێیە ؟ ئەو پیاوە پیر و پەککەوتەیە کە لەکاتی چا خواردنەوەدا نیوەی چایەکە دەڕێژێت بەهۆی لەرزینی دەستیەوە ، بەلاَم لەکاتی گەورەترین تەنگانەدا پێت دەڵێ رۆڵەکەم مەترسە من لە پشتتم ئەوسا هەست دەکەیت گەورەترین کێوت لە پشتە .

٧٦٣. هەرکاتێك توانیت کاتەکانت دابەش بکەیت ئەوا ئەو رۆژەت دەبێت بە سندوقێك کە زۆر شت دەگرێت .

٧٦٤. ئەگەر بە داناییەوە فرمانت کرد دڵنیابە بە شادومانیەوە ملکەچت دەبن .

٧٦٥. وامەزانە ئەو شتەی دەچێتە ناو دەمی مرۆڤەوە دەم پیس دەکات ، بەڵکو ئەو شتەی لێوەی دەردەچێت دەم پیس دەکات .

٧٦٦. بیرت بێت ئەو کەسانەی شایەنی پەیکەرن هیچ پێویستیەکیان پێی نیە .

٧٦٧. پێشوازی گەرم باشترین خواردنە کە پێشکەشی میوانەکەتی بکەیت ، وە لە یادت بێت کە زۆرجار بۆ کرینی شتێك پێویستە شتەکە نەکری تا بتوانی بیکریت ! چۆن ؟!

" کاتێك گۆشت گرانە هەوڵدە نەیکریت ؛ بەمە وای لێدێت گۆشت فرۆشەکان گۆشتەکان هەرزان کەن تا بتوانن لە کاری ئاسایی ژیانیاندا بەردەوام بن و کاڵاکانیان لەسەر نەمێنێتەوە لە کۆتایی دا بە ئەندازەیەك هەرزاندەبێ کە بتوانرێ بکڕدرێت .



٧٦٨. زۆر جار کردنی دوژمنت بە دۆستت تێك شکاندنیەتی ، هەندێ جاریش خۆت بەرپرسیاری لە کوشتنی خۆت .

٧٦٩. بڕیار لەسەر مرۆڤێك مەدە بەوەی کە شتێك نازانێت ، بەڵکو بڕیار لەسەر ئەوەی بدە کە دەیزانێت چونکە ماسی لە ئاودا تاقیدەکرێتەوە باڵندەش بە فڕین .

٧٧٠. هەرکات ناخی ڕاستەقینەی خۆت ناسی ئەوکات قسەی خەڵك کارت تێناکات .

٧٧١. مرۆڤی ئاکار و ڕەوشت بەرز بەوە بناسە ئەگەر ستایشت کرد شەرمەزار دەبێت ، وە ئەگەر هێرشت کردە سەری بێ دەنگ دەبێت .

٧٧٢. هەرگیز بە خۆزگە خواستن ناتوانیت کارەکانت جێبەجێ بکەیت ، بەڵکو بە ویست و ئیرادە دەتوانیت موعجیزەکان دروست بکەیت .

٧٧٣. هەرکات ویستت نزا بکەیت ئەوا باشترین کات بۆ ئەم کارە کۆتایی سێیەکی شەوە بەتایبەتی لەکاتی سوژدە بردندا .

٧٧٤. ئەگەر پلانت نەبێت بۆ ژیان ئەوا دەکەویتە ژێر پلانی کەسانی تر ، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا پیلانە نەك پلان .

٧٧٥. هەرکات سواری ﴿ با ﴾ بیت بۆ ئەوەی لەدەست رزق ڕاکەیت ، ئەوا رزق سواری هەورە تریشقە دەبێت بۆ ئەوەی بگات بە تۆ ، کەواتە دڵنیابە کەس پشکی کەس نابات و ناخوات .

٧٧٦. ئەوەی لەسەر تۆ ئەوەیە بیکەیت وەك ﴿ بارانی رەحمەت ﴾ بیت هەرکات و لەهەر شوێنێك دابەزیت سوودت بۆ دەورووبەرت هەبێت .

٧٧٧. ئەگەر وانە بێژیت یان مامۆستایت هەردەم قەڵەم یان ماجیکی نووك پان بەکاربێنە چونکە کاردانەوەی باشتری دەبێت بۆ قوتابیان وە دوورکەوە لە بەکارهێنانی رەنگی سوور چونکە وا لە قوتابیان دەکات خەویان بێت .

٧٧٨. هەرگیز منداڵەکەت و کەسانی تر فێری خواردنی ماسی مەکە ، بەڵکو فێری ڕاوە ماسیان بکە .

٧٧٩. خوێنەری ئازیز : مادام دەوڵەمەندی شەرەف مەندی نیە کەواتە هەژاریش شەرمەزاری نیە ، وە هەرچەند دەوڵەمەند بیت ناتوانی بەرتیل بە ملك الموت بدەیت .

٧٨٠. پێش ئەوەی داوا لە خودا بکەیت دونیات پێ بدات داوای لێبکە کەسێکت پێ بدات بە دونیات نەدات .

٧٨١. هەندێ جار پێکەنینی کەسێك گریانی ناخی دڵیەتی ، بەڵام بۆ ئەوەی کەس بۆی نەگری هەمیشە پێکەنین گریانیەتی .

٧٨٢. بۆ زانیاریت دوو جۆرە شێتمان هەیە : یەکێکیان ئاستی بیرکردنەوەیان لەچاو خەڵك نزم ترە ئەمە خراپە ، دووەمیش : ئاستی بیرکردنەوەیان لەچاو خەڵك بەرزترە ئەمەیان باشە ، بۆیە هەوڵدە لە جۆری دووەم بیت نەك یەکەم .

٧٨٣. زانستی مرۆڤایەتی سەرکردە دروست دەکات ، زانستەکانی تریش شارستانیەت .

٧٨٤. مرۆڤ بەو کەسە سەرسام دەبێت کە لەسەرەوەی خۆیەتی لەو ئاستەی کە ئەو لێیەتی.

٧٨٥. هیچ کات زانست هەندێکی خۆیت پێ نابەخشی مەگەر تۆ گشتی خۆت پێی نەبەخشی وە هەرکات تۆ بەشێکی خۆتت پێ بەخشی ئەو هیچی خۆی پێت نابەخشێت ، هەربۆیە خۆشەویستیش زانست بۆی نەهاتە ماڵەوە بەڵکو خۆی بەسەر لوتکەکانەوە سەرکەوتووە تا فێری زانست ببێت .



٧٨٦. مرۆڤە ژیرەکان پێشبینی کارەکان دەکەن پێش ڕوودانیان ، وە مرۆڤە ئاساییەکان لەکاتی ڕوودانیان ، وە گەوجەکانیش پاش ڕوودانیان .

٧٨٧. هەرکات ووتارت بۆ کەسانێك دا هەرگیز بیرلەوە مەکەوە کە ئاستی ئەوان لە ئاستی تۆ بەرزترە بەڵکو یەك شتت بیربێت کە ئەوان بۆ ئەوە هاتوون گوێ لە تۆ بگرن .

٧٨٨. باشترین مامۆستا ئەو مامۆستایەیە کاتێك پۆلەکەی جێ دەهێڵێت کۆمەڵێك پرسیار لای قوتابیەکانی دروست دەکات و زیاتر بیریان فراوان دەکات تاکو بتوانن ببن بە ڕەخنەگری بنیاتنەر.

٧٨٩. ئەگەر من توانیبم شتێك لە دووری ببینم بە شێوەیەك کەسانی دەورووبەرم نەتوانێ ببیینێت ئەمە ئەوە دەگەینێت کە من لەسەر شانی پیاوانی مەزنی رابردوو وەستاوم بۆ ئەوەی ڕێگای دووری داهاتووم زیاتر ڕۆشنتر ببینم ، بۆیە سوپاسیان دەکەم .

٧٩٠. بە شێوەیەك سەیری شتەکانی دەورووبەرت بکە کە هەموویان بۆ ئەوە دانرابن و دروست کرابن یارمەتی تۆ بدەن بۆ ئاسانکاری ژیانی ڕۆژانەت نەك وەك ڕێگرێك تێیان بڕوانی چونکە ئەوەی بەدەستەکانی کاردەکات کرێکارە وە ئەوەی بە دەست و ئەقڵی کاردەکات پیشەکارە وە ئەوەی بە دەست و ئەقڵ و هەستەکانی کاردەکات هونەرمەندە وە ئەوەی کار بە هونەرمەند دەکات و لە هونەر دایدەرمێنیت سیاسەت مەدارە ! .

٧٩١. هەرچەندە عەقلت بە زانست دەوڵەمەند کەیت بیرۆکەی مەزنتر دێت بە خەیاڵت ، وە هەرچەندە زیاتر لە شت بڕوانی و تەرکیزی لەسەر کەیت دوو هێندە هزرت فراوان دەبێت ، بەشێوەیەك بە بینینی هەرشتێك دەرگایەکی جیاوازت بۆ دەکرێتەوە بۆئەوەی بتوانی هەنگاوی زیاتر بنێیت بۆ بوون بە سەرکردەیەکی سەرکەوتوو .

٧٩٢. هیچ شتێك کارەکانی مرۆڤ هێواش ناکات هێندەی " تـــرس " وە هیچ شتێك نیە وا بکات کارەکانی مرۆڤ بەخێرایی ئەنجام بدرێت هێندەی " بوێری و متمانە بەخۆ بوون" .

٧٩٣. هەردەم بە پۆزەتیڤانە بیرکەوە بۆ ئەوەی کارەکانت بە دروستی ئەنجام بدرێت ، کارە بچووکەکانت بە جوانترین شێوە ئەنجام بدە کارە گەورەکانیش خۆیان خۆیان چارە دەکەن .

٧٩٤. هەوڵمەدە شتەکانی دەورووبەرت ببینی ، بەڵکو هەوڵدە لە شتەکان بڕوانی ، چونکە بینین وا لەچاو دەکات تەنها وێنەکان بگوازێتەوە بۆ مێشك بەڵام تێڕوانین وا لە چاوەکان دەکات هاوەڵ بن لەگەڵ مێشك بۆ ئەوەی کاتێ وێنەکە خەزن دەکات بەراوردی بکات بە وێنەکانی پێش خۆی و دوای خۆی تاکو سوود لە ووردەکاری شتەکە ببینێ و بیرەوەری زیادکات .

٧٩٥. هەرچەند زیاتر هەستەکانت بەکار بهێنیت ، هێندە زیاتر کەسانی بەرانبەرت ئاسانتر و زووتر لێت تێدەگەن .

٧٩٦. زیرەکی چیە ؟ بریتیە لە توانای گۆڕینی زانیاریەکان بۆ وێنە ، پاشان بەستنەوەی گشت وێنەکان بەیەکتریەوە بۆ ئەوەی بە ئاسانترین شێوە بتوانین لە کاتی پێویستی خۆیدا وێنەکان بگەڕێنینەوە ، بە واتایەکیتر ( دۆزینەوەی چارەسەرە بۆ کۆسپەکانی ژیان بەڵام بە کەمترین ماوەدا ) .



۷۹۷. بۆئەوەی پلەی بیرەوەریت زیادکەیت و خانەکانی مێشکت چالاك کەیت زۆرکەم گرینگی بە کاتژمێری دەست و دیوار بدە ، هەوڵدە پشت بە ئەو کاتژمێرە بایلۆجیە ببەستیت کە لە بەشی پێشەوەی مێشکی مرۆڤدا هەیە و هەموو بوونەوەرێك و گیاندارێك پشتی پێ دەبەستن جگە لە مرۆڤ نەبێت پشتی تێکردووە ، ئەم کاتژمێرە بایلۆجیەش تەنها بەم ئایەتە پیرۆزە قورمیش دەکرێتەوە {قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَادًا لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَدًا} ﴿الكهف : ۱۰۹﴾

۷۹۸.ئەوە بزانە هیچ هەڵەیەك لە بیرەوەری مرۆڤدا نیە بەڵکو هەڵە لە ڕێگای مامەڵەکردنە لەگەڵ مێشکی بەرامبەرمان دا ، ئەمەش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە : یان ئێمە بە هەڵە فێربووین بۆیە کەسانیتریش بەهەڵە فێردەکەین یانیش هۆیەکەی ئەوەیە کە ئێمە تا ئێستا فێری هونەری فێربوون نەبووین کە چۆن فێربین تا کەسانیتریش فێرکەین .

۷۹۹. جاران کە میوانمان دەهات پرسیاری قیبلەی لێ دەکردین بەڵام ئێستا پرسیاری پاسوۆردی وایەرلیسەکەمان لێ دەکەن .

۸۰۰. فێری یاسای زێرین بە لە کارگێریدا : ﴿ هەرکەسێك نەتوانێت گرفتەکان پێوانەکات و نەخۆشیەکان دەست نیشان بکات ناشتوانێت بەرێوەیان بەرێت و چارەسەریان بکات﴾ .

٨٠١. چۆن دەتوانی " وێنەی دەنگەکان " ببینی ؟ سەرەتا بۆ ماوەی شەش چرکە چاوەکانت داخەو وابیرکەوە کە باران دەبارێت بەشێوەیەك کە گشت هەستەکانت لەم بیرکردنەوەدا بەژداری بکەن ، بزانە دەتوانیت هەست بە کەوتنە خوارەوەی چرپە چرپەی دڵۆپەکانی باران بکەیت ؟ وە دەتوانی پاش کردنەوەی چاوەکانت دووبارە دەنگەکە ببیستی ؟ ئەگەر توانیت ئەوا تۆ خاوەنی تایبەتمەندیەکی گرینگیت کە پێی دەڵێن " بینەری دەنگەکان " وە بەم شێوەیە ئەگەر توانیت بۆنی شتێك بکەیت بەخەیاڵت ئەوا تۆ دەبیت بە ﴿ بینەری بۆنەکان ﴾ وە بۆ هەستەکانی تریش بەم شێوەیە ...

٨٠٢. بۆئەوەی پارچە هۆنراوەیەك بە ئاسانی ئەزبەرکەیت پێویستە کەمێك زیاتر دەنگت بەرزکەیت لەکاتی خوێندنەوەی هۆنراوەکە پاشان چەند جارێك بینووسیتەوە ئەگەر کرا لە ووشەکاری هۆنراوەکەش تێبگەیت بەمە دەتوانی سەرکەوتن بۆ کارەکەت مسۆگەر بکەیت .

٨٠٣. ئەگەر ویستت حەوانەوەیەك بدەیت بە مێشکت ئەوا کەمێك شیر بخۆ پاشان بۆ چەند خوولەکێك لە باخچەیەکی هەوا پاك وەرزش بکە و دەم دەمەیەکیش برۆ بەر تیشکی خۆر پاشان بۆ کەمێکیش بیت پێش نیوەرۆ بخەوە .

٨٠٤. رۆژێکی هەفتە تەرخان کە بۆ ئەوەی زیاتر بخەویت لەچاو رۆژەکانی تر بەشێوەیەك کە تێرخەو بیت و گشت لەشت ئاسوودە بکات چونکە چۆن رۆنی سەیارە بۆ بزوێنەر بە سوودە ، تێرخەویش هێندە بۆ بیرکردنەوە و مێشك بەسوودە .

٨٠٥. بۆ هیچ کەسێك نیە کەسایەتی تۆ دروست بکات جگە لە خۆت نەبێ ، هەر بۆیە چارەنووسی ئەم کارەش لەنێو دەستی خۆت دانراوە و بۆ تۆ بەجێماوە .

٨٠٦. بیرکردنەوەیەکی وورد پێش قسەکردن وا لە گوفتار و کردەوەکانی مرۆڤ دەکات بڕیارەکانی یەکلایی کەرەوە بێت ، هەربۆیە ئێمە قوتابی پێدەگەینین پێش ئەوەی تێبگەینین کە بۆچی پێیدەگەینین ؟! لە ئەنجام تەنها قۆناغەکانی ژیانیان پێدەبڕین .



٨٠٧. بریا ناخمان وەك ناوەکانی خۆمان با تاکو مردن گۆڕانکاری بەسەردا نەهاتبا .

٨٠٨. باوەر دەتوانێ وا لە مرۆڤ بکات موعجیزەی بۆ دروست بێت بەمەرجێك بزانیت بە ژیری بەکاری بێنیت .

٨٠٩. هەرکات مرۆڤێك بێ ئاماج ژیا ، لە بازنەی مرۆڤایەتی دەرچووە و وەك ئەو کەسە وایە کە تەواوی ژیانی لە گۆڕستاندا بەسەر بردبێت .

٨١٠. هەردەم رابردووت بکە بە سووتەمەنی و ووزە بۆ داگیرسادنی چرای ئێستات تاکو داهاتووت پێ رووناك بکەیت .

٨١١. هەرگیز وا بیرمەکەوە کە ئەو شتەی لای تۆ گرینگ نیە لای کەسانی تریش گرینگ نیە ، بەڵکو هەموو شتێك لای کەسانی خۆی گرینگی خۆی هەیە و بابەتەکە رێژەییە .

٨١٢. ناتوانی هەست بە ئازاری کەسانی تردا بکەیت تا خۆت لە شوێنی ئەوان دا نەبینیتەوە.

٨١٣. ئەو کەسە دۆڕاوی ڕاستەقینەیە کە لە بەهەشتێکی ئەندازە فراوانی ئاسمان و زەوی شوێنی حەسانەوەی نەبێت .

٨١٤. ئەو کەسەی تووشی نەخۆشی ترس بووە وەك ئەو کەسە وایە کە بۆ ماوەی بیست ساڵە زیندانی کراوە و بۆ ساتێکیش بەخەیاڵی نەهاتووە دەرگای زیندان کراوەیە تا ڕابکات .

٨١٥. تاقیکردنەوەی مرۆڤە زیرەکەکان کاتێك دەردەکەوێت کە بە خێراترین کات ڕووبەڕووی ئەو گرفتانە دەبنەوە کە یەکەم جارە تووشیان دەبێت و ناشڵەژێن وە بە کەمترین کات ڕێگا چارەی بۆ دەدۆزنەوە .

٨١٦. پاش هەموو ﴿ ٤٠ ﴾ خوولەکێك لە کارکردن و قسەکردن ﴿ ٥ ﴾ خوولەك پشوو بدە و چەند قومە ئاوێکیش بخۆرەوە .

٨١٧. ئەگەر ویستت لە جەوهەری زانیاری بوونەوەردا تێبگەیت زۆر بپرسە بۆچی .... ؟! .

٨١٨. چۆن بۆ هیچ پەیکەرتاشێك نیە ڕۆح بخاتە پەیکەرەکەیەوە ، بۆ هیچ کەسێکیش نیە ڕۆح لە تۆ بسەنێتەوە مەگەر بە ویستی خوا نەبێت ، کەواتە لەهیچ شتێك نیگەران مەبە .

٨١٩. خودای مەزن یەك ڕووی پێ بەخشیت ، بۆ دەیکەیت بە دوو ؟! دوو چاوی بە مرۆڤ بەخشیوە تاکو بە یەك چاو سەیری کەسەکان نەکات ، وە دوو گوێچکە و یەك زوبانی پێ بەخشیوە تاکو زۆر گوێ بگرێت و کەم قسە بکات ، وە دوو دەستی بە مرۆڤ بەخشیوە تاکو بە دەستێك یارمەتی خۆی بدات و بە دەستەکەی تریشی یارمەتی خەڵك بدات بەڵام زۆربەی خەڵکان یەك دەستیان بەکاردێنن ، وە دوو لاقی بە مرۆڤ بەخشیوە تاکو بە یەکێکیان بۆ دونیا ڕاکات و بە ئەویتریش بۆ قیامەت کەچی زۆربەی خەڵکان یەك لاقیان بەکاردێنن ، وە خوای گەورە یەك دڵی بە مرۆڤ بەخشیوە تا بە خۆشەویستی خوا پەیوەست بێت و ئەو بپەرستێ کەچی مرۆڤەکان چەندین دڵیان بۆخۆیان زیاد کردووە ، وە خوای گەورە یەك تەمەنی بە مرۆڤ بەخشیوە تا لە پێناو ژیان بمرێ کەچی مرۆڤەکان لە پێناو مردن دەژین .

٨٢٠. هەرکات مرۆڤ کەسایەتی خۆی دۆڕاند و لەدەست دا ئەوا مەودای نێوان خۆی و گۆڕەکەی تەنها شەقاوێکە ، وە سوێند بەخوا ( پـاك نەبیت پـاکـت دەست ناکەوێت ) وە نە ئیسلام تیرۆرستە و نە تیرۆرستانیش ئیسلامن ئەمە کۆتا پەیامە .



٨٢١. خۆت لە کەسێك توورە مەکە کە تووڕەییت کاریگەری بەسەر ئەودا نەبێت .

٨٢٢. زۆر قسە مەکە ، چونکە زۆر قسە کردن وا لە مرۆڤ دەکات ووشەکان یەکتریان بیربچێتەوە ، وە ئێمەش لە رۆژگارێك دا دەژین کە خەڵك کاغەزی سپیش دەخوێنێتەوە .

٨٢٣. بەسەر کەسێکدا هەڵمەلێ و باسی مەکە کاتێ ئەو بزانێ ئەوەی تۆ دەیڵێیت پێچەوانەیە .

٨٢٤. هەموو رۆژێك فێری زانستێك بە چ زۆر بێت چ کەم ، کارێکی باشیش بکە چ بچووك بێت چ گەورە ، وە ئامۆژگاری کەسێك بکە چ منالّ بێت چ گەورە .

٨٢٥. هەرکات کەسێکی رەشبین دەرگای دونیای لەسەر داخستیت و ووتی ژیان نرخی نەماوە و رۆژی دوایی نزیك بۆتەوە چونکە ئێمە لە کۆتایەمین تەمەنی بوونەوەردا دەژین ، بە گەشبینیەوە پێی بڵێ راستە ئێمە لە کۆتایین بەلاّم ئەگەر کۆتاییەکەمان کرد بە سێ بەش ئێمە لە ناوەراستی ئەم کۆتاییەدا دەژین نەك لە کۆتایی کۆتاییەکە .

٨٢٦. بەداخەوە هیچ میللەتێکی سەیری وەك میللەتی خۆمانم نەبینیوە لە لاسایی کردنەوەی رۆژئاواکاندا ، بەجۆرێك ئەگەر ئەوان تەنورەکانیان سانتیمەترێك کورت کەن لای ئێمە بستێك کورت دەبێت ، وە ئەگەر ناتوانی رێز لە خێزانت بگریت بەجێی بێڵە بۆکەسێکی لەخۆت پیاوتر .

٨٢٧. عیشقی مرۆڤەکان بە خۆ هەڵخەڵەتاندن دەست پێ دەکات و بە هەڵخەڵەتاندنی کەسێکیتر کۆتایی دێت بەڵام عیشقی ڕاستەقینە خۆشەویستی خودایە کە سەرەتا و کۆتایی تەواوکەری ژیانە .

٨٢٨. هیچ دەرفەتێك لەدەست مەدە بۆ خوێندنەوە ، تەنانەت جنێوی سەر دیوارەکانیش بخوێنەوە هیچ نەبێت فێری ئەوە دەبیت هەمان جنێو دووبارە نەکەیتەوە .

٨٢٩. ئەگەر پرسیاریان لێ کردیت لەبارەی گیاندارێکەوە هێلکە دەکات یان فەرخە ؟ بڵێ ئەگەر گیاندارەکە گوێچکەکانی بۆ دەرەوە دەرهاتبوو ئەوا فەرخە دەکات وە ئەگەر گوێچکەکانیان بۆ ژوورەوە بوو ئەوا هێلکە دەکات .

٨٣٠. نەکەیت وا مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکەیت کە گشتیان فریشتەن یاخود گشتیان شەیتانن بەڵکو وا مامەڵەکە کە هەندێکیان ڕەوشتیان وەك فریشتەن و هەندێکیتریش سیفەتی شەیتانیان هەڵگرتووە بۆیە هاوەڵی چینی یەکەم بکە و دوورکەوە لە چینی دووەم .

٨٣١. هەرگیز وا بیرمەکەنەوە کە ئێمە بە زانست یان تەکنەلۆجیا یان بە سەربازی یان پیشەسازی و بازرگانی و نەوت دەتوانین شان بەشانی وڵاتانی ئەوروپی بوەستین ، بەڵکو بە یەك شت دەتوانین وایان لێ بکەین لەسەر چۆك لەبەر دەمماندا بوەستن و چۆك دادەن ئەویش بە تێگەیشتن لە حەقیقەتی ﴿ ئیسلام ﴾ە ، بۆیە تکایە هەستنەوە و بەئاگاوەرن ئەو پەیامە بگەیەنن کە پێویستە بگات .

٨٣٢. ئەگەر کەسێك هاتە لات و ووتی من گشتی قورئانم لەبەرکردووە بڵێ جا چی ڕوویداوە ؟ تەنها کۆپییەکیتر لە قورئان زیادی کردووە ، قورئان بۆ ئەوە دانەنراوە ئەزبەر بکرێت بەڵکو بۆ ئەوە دانراوە تێیبگەین و کاری پێ بکرێت .

٨٣٣. ئەگەر ﴿ ٨ ﴾ کاتژمێریان پێ بەخشیم بۆ ئەوەی دارێکی مەزن ببڕمەوە ئەوا ﴿ ٦ ﴾ کاتژمێر تەرخان دەکەم بۆ تیژ کردنەوەی مشارەکەم .

WRONG!

٨٣٤. قورسترین ووشە لای مرۆڤ ئەوەیە بڵێ ﴿ من هەڵەم ﴾ بۆیە نەوتنی بە ئاسایی وەرگرە .

٨٣٥. کاتژمێرێك لە پلان دانان سێ کاتژمێری کارکردنت بۆ دەگەڕێنێتەوە .

٨٣٦. هەوڵدە وەك ﴿ هەنگ ﴾ بیت ، لە هەموو گوڵێك هەوڵدەدات باشترینی هەڵبژێرێت .

٨٣٧. هاوسەرگیری لە ڕاستیدا وەك موتوربەکردنی دوو درەخت وایە ، ئەگەر باش یەکیان گرت ئەوا هەردووکیان بەر دەگرن ئەگینا هەردووکیان ووشك دەبن .

٨٣٨. ئەگەر هاتوو کاتی ژەمی خواردنەکەت بیرچووەوە با کاتی خوێندنەوەت بیرنەچێت.

٨٣٩. بیرت بێت کە چوار هەزار ووشەی بێ سوود لە چوار ووشەی بە سوود کەمترە .

٨٤٠. ئەگەر خەونێکی خۆشت بینی ئەوا بۆ خۆشەویسترین کەست باس بکە کە زانا بێت لە لێکدانەوەیدا ، بەڵام ئەگەر خەونەکەت ناخۆش بوو بۆ کەس باسی مەکە و لەکاتی هەستانەوەت لە خەودا سێ جاران بەلای چەپتدا ﴿ تـف ﴾ بکە و لەگەڵ هەر جارێك شەیتان بە لەعنەت بکە و پاشان برۆ دەست نوێژێك بشۆ دوو رکاعەت نوێژ بکە و نزا بکە خوا لە زیانی ئەم خەوە بەدوورت بگرێت ، ئەگەر هاتوو زیانیشی هەبێت ترسی نامێنێت ، وە بەسە گەورەیی کە ﴿ الله ﴾ خودات بێت بەسە سەربەرزیش تۆ بەندەی ئەو بیت .

٨٤١. هەردەم وا لە هاوڕێیە خۆشەویستەکانت بکە ﴿ ١٠ ﴾ لەو هەڵانەی لە تۆدا دەیبینن بۆتی بنووسن تاکو بتوانی هەڵەکانی خۆت چارەسەرکەیت ، وە هەرگیز وا بیرنەکەیتەوە کە بێ هەڵەیت ، وە بۆ ئەم کردارە داوا لە قوتابیەکانیشت بکە یارمەتیت بدەن بەوەی هەر یەکەیان لەسەر پارچە کاغەزێك ئەو هەڵەیەت بۆ بنووسن کە ئەوان دەیبینن بێ ئەوەی ناویان بنووسن ، پاشان گشتی کاغەزەکان بخوێنەوە بزانە کام لە کاغەزەکان هەمان بیروڕایان هەیە و کۆکن لەسەر چەند خاڵێك ، بەم شێوەیە دەتوانی خاڵە لاوازەکانی خۆت بگۆڕیت بۆ خاڵی بەهێز .

٨٤٢. یاسایەکی زێڕین بۆ کاتی ووتاردان : ﴿ هەرچەندە ماوەی قسەکردنت کەم بێت ، هێندە زیاتر کاتی پێویستە بۆ ئامادەکردنی بابەتەکە ، وە هەرچەندە ماوەی ووتارەکەت زیاد بێت کاتی کەمتری پێویستە بۆ ئامادەکردنی بابەتەکە ﴾ چونکە هەرچەند کات کورت بێت دەبێ هێندە خۆت ماندوو کەیت بەوەی ووشەکانت چڕوپڕتر کەیت بەجۆرێك گوێگر بتوانی لە گشت ئامانجی بابەتەکە بگات بە کورتترین ماوەدا .

٨٤٣. هەوڵدە ئەو پارەی لێت زیادە و پێویستت پێ نیە بە قەرز بیبەخشیت بەو کەسانەی کە پێویستیان پێیەتی چونکە هەموو خێرێك یەك بە دەیە جگە لە پارە بە قەرزدان نەبێت یەك بە هەژدەیە .

٨٤٤. لە پرێنسی بە سەرکردەبوون هاتووە دەڵێت : ئەو کەسەی ناتوانێت فەرمان بدات دەبێت فەرمان بەرێت .

٨٤٥. هەرکەسێ پێی ووتی ئەو ساتەت لەبیرە کە دۆڕایت و شکستت هێنا ؟ بڵێ من ئەوەم لەبیرە کە فەرامۆشم کردبوو و کردم بە ئەزموون بۆ ژیان ، تۆش ئەوەت بیربێت کە قسەکانی تۆ لەلایەن منەوە وەك پەیوەندی وەڵام نەدراوەیە !!! .



٨٤٦. یەکێك لە ئادادپەروەری و ئیفلیجی رۆژگار لەوەدایە کاتێ سەربازێك لە جەنگ دا دەکوژرێ ئەفسەرەکەی پلەی بەرزدەگرێتەوە .

٨٤٧. هەرکات لە تۆیان پرسی کێشەی دونیا چیە ؟ بڵێ ، ئەگەر بمانەوێت کەسێك دەست نیشان بکەین کە زیاتر لەوانی تر ژیانمان پێ ببەخشێت بێ شەك دەگەین بە خـــودی ﴿ خۆمان ﴾ .

٨٤٨. رینیە دیکارتی فەرەنسی دەڵێت ﴿ من بیردەکەمەوە ، کەوابوو هەم ﴾ بەڵام بۆ ئەم رۆژگارە باشتر وایە بڵێین ﴿ من ئەنجام دەدەم ، کەوابوو هەم ﴾ .

٨٤٩. هەرکەس بژێوی ئەمرۆی هەبێت و بتوانێ بە ویژدانێکی ئارام بخەوێت و ستەم لە کەس نەکات و لەناو کۆمەڵگەدا رێزداربێت ئەوا ئەم کەسە دەوڵەمەندترین کەسی جیهانە .

٨٥٠. هەردەم بۆ ئامانجەکانت نیشانە لە مانگ بگرە چونکە ئەگەر ئامانجەکەشت نەپێکا تیرەکەت لەناو ئەستێرەکاندا دەچەقێت .

٨٥١. هەمیشە خەون و خەیاڵی گەورەت هەبێت چونکە خەیاڵە گەورەکان مرۆڤە گەورەکان بۆلای خۆیان ڕادەکێشن .

٨٥٢. بەکەس مەڵێ ئەگەر ئەم کارەم بتوانیبا ئەنجامم دەدا ، بەڵکو بڵێ ئەگەر ئەنجامم بدایە بێگومان دەمتوانی .

٨٥٣. هەڵسوکەوتی تۆ ئەو ڕادەیەت لە داهاتوو دیاری دەکات کە بۆت هەیە بیبینیت .

٨٥٤. لە نێوان کەسێك کە خوێنەوارە و ناخوێنێتەوە لەگەڵ کەسێك کە نەخوێندەوارە هیچ جیاوازیەك نیە .

٨٥٥. ئەگەر خۆت ئایندەیەك بۆ خۆت دروست نەکەیت ئەوا بە پەشیمانیەوە دەوروبەرت بۆت دروست دەکات .

٨٥٦. وەك ئەو پیاوە سەرخۆشەمەبە کاتێ لە وێستگەی شەمەندەفەر وەستابوو لە هاورێیەکی پرسی : لە کوێ دەتوانم دیاریەك بۆ منالە بچکۆلانەکەم بکڕم بۆ ئەوەی دڵخۆشی کەم ؟ هاورێیەکەشی ووتی : دەکرێت دیاریەك پێشنیاربکەم کە بەڕاستی دڵخۆشی بکات ؟ ووتی بەڵێ ، هاورێکەش ووتی ﴿ لە جیاتی باوکێکی سەرخۆش باوکێکی هۆشیاری بۆ بکە بە دیاری ئەم کارە زۆر خۆشحاڵی دەکات ﴾ .

٨٥٧. ئەگەر فەرمانبەرێکت تەلەفۆنی بۆ کردیت ووتی : ئێمە تووشی کێشەیەکی گەورەبووین ؟ بڵێ هەمیشە لە یادتان بێت لە بەرامبەر هەر کێشەیەك دا دەستکەوتێك و چارەسەرێك بە هەمان ئەندازەی کێشەکە هەیە جا هەوڵدەن بەسەریدا زاڵ بن .

٨٥٨. لە ژیاندا هەوڵدە نە گاڵتەکەر بیت نە گاڵتەپێکراو .

٨٥٩. یەکێك لە تایبەتمەندیە زیندووەکانی ویژدانی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئەوەیە کە هەندێك جار ناتوانێت خۆی خۆی ببەخشێت .

٨٦٠. زۆر خەیاڵکە ، سنووری بینین بشکێنە ، ئەو شتانە ببینە کە چاوەکان ناتوانن بیبینن چونکە خەیاڵەکان دایك و باوکی ئەگەرەکانن ، ئەگەرەکانیش نەوەی خەیاڵەکانن ، وە مرۆڤە بێ ئامانجەکان مەجبورن تەواوی تەمەنی ژیانیان بۆ مرۆڤە ئامانجدارەکان تەرخان بکەن هەربۆیە ژێر بە و بزانە لەکامیان دا دەبیت .



٨٦١. کاتێك ژیان سەد هۆکار بۆ گریان نیشانی تۆ دەدات ، تۆ هەزار هۆکار بۆ پێکەنین نیشانی ئەو بدە .

٨٦٢. ئەو ئەندێشانەی کە پێشتر لە مێشکتاندا بوو ئەمڕۆی ئێوەی داهێناوە ، وە ئەو ئەندێشانەی ئەمڕۆ لە مێشکتاندایە سبەینەی ئێوە دادەهێنێت .

٨٦٣. گرینگ نیە چی دەبینیت ، گرینگ ئەوەیە چۆن دەیبینیت ؟!

٨٦٤. داهات ئەو شتە نیە کە هەتانە ، بەڵکو ئەوەیە کە هەن .

٨٦٥. کاکی دکتۆر چی دەبێت ئەگەر پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەریەکەت ستریلەکان بژمێریت و پێش کۆتاییش دووبارە ئەژمێریان بکەیت ؟! بەمە دڵنیا دەبیتەوە کە هیچت لەناو هەناوی خەڵك جێ نەهێشتووە .

٨٦٦. ئێمە زۆر بە هەڵە لە ناوداریەتی و ناوبانگی گەیشتووین : لە ڕاستیدا ناوداریەتی ئەوەیە کە لە لایەن ئەو کەسانە ناسراوبیت کە نەتناسن نەك بە پێچەوانەوە .

٨٦٧. ئەو کەسەی کە دەبێ لێی ببورن خۆتانن نەك کەسانی تر .

٨٦٨. هەوڵدە هەردەم گشت پلەکانی سەرکەوتن ببڕیت ئەگینا دەبن بە پایە بۆ پلەی سەرکەوتنی کەسانی تر چونکە ژیان چاکەیە و چاکەش گەنجینەیە بزانە بە کێی دەسپێریت .

٨٦٩. گرینگترین هۆکار بۆ ئەوانەی کە هیچ وەڵامێکیان دەست نەکەوتووە ئەوەیە کە هیچ پرسیارێکیان نەکردووە .

٨٧٠. یەکەمین هەنگاوی بردنەوە بریتیە لە دۆڕان .

٨٧١. ئەگەر کەسێکت بینی نۆ چاکە و یەك کەم و کوڕی هەبوو ئەوا بیر لە نۆ چاکەکەی بکەرەوە و کەم و کوڕیەکەی فەرامۆش بکە ، وە ئەگەر کەسەکە نۆ کەم و کوڕی هەبوو لەگەڵ یەك چاکە ئەوا باس لە یەك چاکەکە بکە و هەردەم کەم و کوڕیەکان فەرامۆش بکە .

٨٧٢. لە تاقیگەی ژیان دووشت پێچەوانەی یەکترن ﴿ عەشق ، ڕق و کینە ﴾ چونکە عەشق تەلیسکۆبە بەلاّم ڕق و کینە مایکرۆسکۆبە .

٨٧٣. هەمووومان بە پلیتی گەڕانەوە هاتووینەتە نێو ئەم دونیایە وە بەرواری گەڕانەوەشمان لەسەر پلیتەکە نووسراوە ، بەلاّم بەداخەوە کە نەخوێنەوارین .

٨٧٤. بەگشتی ئاژەڵان لە مرۆڤەکان شادترن چونکە بە تەواوی بێ ئاگان لەوەی کە دەوروبەر لە بارەیانەوە چی دەڵێن و چۆن بیردەکەنەوە .

٨٧٥. کۆلکەی دار بە تەنیا ناجوڵێت ، بەڵام رووبار دەتوانێت بیگەینێت بە دوورترین شوێن ئەمەش ئەوکاتە روودەدات کە کۆلکەدار خۆی بە ئاوی رووبار بسپێرێت ، کەواتە تۆش خۆت بە خودا بسپێرە دەگەیت بە ئامانج .

٨٧٦. ئەوەندەی بیرلەوە دەکەیتەوە کە بۆچی جیهان لەمە باشتر نابێت ؟ بیر لەوە بکەوە و بڵێ چۆن دەتوانم باشتری بکەم ؟ لەمەوە وەلاّمێکت بۆ پەیدادەبێت .

٨٧٧. گەورەترین مەترسی لە ژیاندا خۆشاردنەوەیە لە مەترسیەکان ، چونکە کەسێك دەست بۆ مەترسی نەبات ، هیچ ناکات و هیچی نیە و ناشبێت بە هیچ .

٨٧٨. هەرکات بینیت ئافرەتێك دەگریت ئەوا بزانە شتێکی لەدەست داوە ، بەلاّم هەرکات بینیت پیاوێك دەگریت ئەوا بزانە هەموو شتێکی لەدەست داوە .



٨٧٩. پێش ئەوەی بە زیندوویی بمریت ، هەوڵدە بە مردوویش زیندووبیت .

٨٨٠. هەموو کات متمانەت بە ئازادی نەبێت ، چونکە ئەگەر شەمەندەفەرێك لەسەر سکەکەی خۆی لایدا لەوانەیە سەربەست و ئازاد بێت بەڵام دڵنیابە ناگات بەهیچ مەبەستێك .

٨٨١. هەردەم سوپاس گوزاری خوابە ، کێ دەڵێت ئەوەی ئەمڕۆ هەتە ئاوات و ئارەزووی بەیانیت نابێت چونکە ئەگەر گورگیش بیت رۆژێك دێت لەبەر عەشقی مەڕێك ببیت بە گیاخۆر .

٨٨٢. خەڵکان بۆ شکست بەرنامە ڕێژی ناکەن ، بەڵکو لە دارشتنی بەرنامە دا شکست دێنن .

٨٨٣. ئەوەی بەهۆی کێشە و نەهاتیەکانەوە فێری دەبین زۆر لەوە زیاترە کە لە دەرفەتەکانی خۆمان فێری دەبین .

٨٨٤. بۆ زیاتر بەدەست هێنانی هەرشتێك دەبێ بەشێکی لێ ببەخشین ، جوتیارێك کاتێك تۆوی زیاتر دەوێت دەبێت بەشێك لە تۆوەکان بە زەوی ببەخشێتەوە ، کاتێك زەردەخەنەی کەسێکتان دەوێت دەبێ سەرەتا زەردەخەنەی خۆتان پێشکەش بکەن .

٨٨٥. ئەگەر ئامانجی هەژارێك و دەوڵەمەندێك پارە بێت ، جیاوازیان چیە ؟ جیاوازی بیرکردنەوەیان ئامانجیان دوور و نزیك دەکات ، هەژاران ئارەزوو دەکەن پارە بەدەست بێنن کەچی دەوڵەمەندەکان باوەڕیان وایە کە بە دەستی دێنن .

٨٨٦. ئەوکات هاوەڵی هاوڕێی خراپیش بکە ئەگەر زانیت تۆ کاریگەریت بەسەر ئەوەوە دەبێت ، وە دوورکەوە لێی ئەگەر زانیت ئەو کاریگەری بەسەر تۆوە دەبێت .

٨٨٧. وامەزانە مەرگ کۆتایی ژیانە بەڵکو تەواوکەریەتی .

٨٨٨. کەسێك لە ژیان بەدوای ئامانج نەگەڕێت بارودۆخی وەك کەشتی بێ کاپتن وایە .

٨٨٩. لە بەرێوەبەرەکەتان مەپرسن بۆچی پلەتان بەرز ناکاتەوە ، ئەم پرسیارە لە کەسێك بکەن کە لە هەمووتان زیاتر شارەزایە ، ئەویش ﴿ خۆتانن ﴾ .

٨٩٠. ئەگەر کەسێك بۆخۆی بەهەمان جۆر کاربکات کە بۆ کەسانی تر دەیکات ، زۆر ناخایەنێت کە خۆی دەبینێت بۆتە خاوەنی کۆمپانیایەك بەهەمان ئەندازە یان گەورەتر .

٨٩١. بەر لەوەی هەوڵدەیت ووتەکانت لەسەر کێلی قەبرەکەت بنووسرێ هەوڵدە کردەوەکانت بنووسرێ .

٨٩٢. پێش ئەوەی بتوانن بارودۆخێك کۆنترۆڵ بکەن هەوڵدەن خۆتان کۆنترۆڵ بکەن بەمە بارودۆخەکەش کۆنترۆڵ دەکرێت .

٨٩٣. ئەگەر لە بەرامبەر ئاوێنەیەك بوەستن ، ئەوا دەتوانن باشترین هاورێتان یان سەخترین دوژمنی خۆتان ببینن .

٨٩٤. باشترین رێگە بۆ سەرکەوتن لەم دونیایە دا ، جێبەجێ کردنی هەمان ئامۆژگاریە کە بۆ کەسانی تر دەیکەیت .

٨٩٥. ئەو رۆژە بە رۆژانی تەمەنتان ئەژمار مەکەن کە خۆر هەڵبێت و ئێوە هیچ گۆڕان کاریەکتان ئەنجام نەدابێت .



٨٩٦. بۆ ئەوەی لە بازنەی شکست دەربچن پێویستە هەردەم ﴿ گومانتان لە گومانەکانتان هەبێت ﴾ .

٨٩٧. هەرگیز وا بیرمەکەوە کەس بە ڕێکەوت بێتە سەر ڕێگات ، هەر مرۆڤێك ، هەر کێشەیەك ، هەر کۆسپێك بۆ ئەوە هاتوون کە فێری شتێکت بکەن .

٨٩٨. ووشەی ﴿ دوێنێ ﴾ بۆ منالأن داهێنراوە ، ووشەی ﴿ بەیانی ﴾ش بۆ مرۆڤە بێ ئیرادەکان داهێنراوە بەلأم ووشەی ﴿ ئەمڕۆ ﴾ بۆ مەزنەکانە .

٨٩٩. هەرکات کاتت بەفیرۆ دا ، زەمەن تۆڵەت لێ دەستێنێتەوە .

٩٠٠. تۆ لەبەر توڕەییت سزا نادرێیت ، بەڵکو لەڕێی توڕەییتەوە سزا دەدرێیت .

٩٠١. هەرکات کەسێك ویستی سوکایەتیت پێ بکات ، هەوڵدە رۆحی خۆت ئەوەندە بەرز ڕابگریت کە سوکایەتی هەرگیز پێی نەگات .

٩٠٢. هەرکات دەرفەتی ئەوەت نەبوو بە شانازیەوە بژی ، دەبێ ئەو دەرفەتەت لە دەست نەچێت کە بە شانازیەوە بمریت .

٩٠٣. مرۆڤ بەپێوە بمرێت باشترە نەك بە چۆك دادانەوە بژیێت ، وە هیچ شتێکیش لەم ژینەدا شایەنی رشتنی فرمێسك نیە جگە لە گوناهەکانمان نەبێت .

٩٠٤. بڕوام وایە هەموو مرۆڤێك ژمارەی لێدانی دڵی سنووردارە ، بۆیە مەبەستم نیە هیچ کامێکیان بەفیڕۆ بدەم .

٩٠٥. لە دوێنێ فێربە کە بۆ ئەمڕۆ بژیت و ئومێدت بە سبەی هەبێت .

٩٠٦. زۆرێك لە شکست هێنەرانی ژیان ، کەسانێکن کە نازانن ساتی سەرکەوتن چەندە لە ئامانج نزیك بۆتەوە و دەست بەرداری دەبن .

٩٠٧. ئەگەر ناتوانی ببیت بە ئەستێرەیەك لە ئاسمان ، هیچ نەبێت ببە بە چرایەك لە ماڵەکەت دا .

٩٠٨. ناتوانم هەڵەیەکی هێندە گەورە بکەم و بڵێم هەرچی بە دووپێ بڕوات مرۆڤە .

٩٠٩. جەژنی من ئەو ڕۆژەیە کە کۆشش و ماندوبوونی ساڵێکی جوتیارێك نەبێتە ئێوارە خوانێکی پاشایەك .

٩١٠. لەبەردەم هیچ سەرگردەیەك و کەسێك مەنوشتێوە و مەی پەرستە ، ئەگەر خۆشیشت ویست دەری مەبرە ، بۆ ئەوەی خۆت نەکەیت بە کۆیلە و ئەویش نەکەیت بە دکتاتۆر.

٩١١. لە فەرهەنگی بیرکردنەوەتدا ووشەی ﴿ خۆزگە ﴾ بگۆرە بە ﴿ دەبێ ﴾ لەجیاتی ئەوەی بڵێی خۆزگە بمزانیبا بڵێ دەبێ بزانم .

٩١٢. لە جەنگێك دا وورەی سەربازەکان دابەزی ، ژەنەڕاڵەکەش بە سەربازەکانی ووت ﴿ ئێمە پاشەکشە ناکەین بەڵکو لەلایەکی ترەوە خەریکی پێشڕەوین ﴾ .

٩١٣. لە شەڕ خراپتر ئەوەیە مرۆڤ هیچی نەبێت شەڕی بۆ بکات .

٩١٤. دڵنیابن ئەگەر دەست پێنەکەن شتێك بەناوی هێڵی کۆتایی لە ئارادا نابێت .

٩١٥. ئەگەر چێژ لە ژیان وەرناگریت بزانە کات بە فیڕۆ دەدەیت .

٩١٦. باشترین پیاو بۆ ئافرەت تا شووی پێ بکات زانای شوێنەوارناسە ، چونکە هەرچەند خێزانەکەی پیربێت و کۆن بێت هێندە زیاتر لای پیاوەکەی نرخی بەرزدەبێتەوە .



٩١٧. هەرکات بە پێکەنینەوە شەقازلەیەکی توندت لە منالێك دا و پێی پێکەنیت دڵنیابە ئازاری نابێت ، بەڵام هەرکات بەهێمنی شەقازلەیەکت لە منالێکدا و رووت گرژکرد بە روویەوە دەبینیت دەیەوێ بگریت ، بەمە دڵنیا دەبیت کە هیچ مرۆڤێك ئازاری لاشەی هێندەی ئازاری ناخی کاری تێ ناکات بۆیە وریابە لە مامەڵەکردن لەگەڵ کەسەکان .

٩١٨. فراوانی دونیا سوودی چیە ئەگەر بیرکردنەوەت وەك پێڵاوەکانت تەسك بێت ؟! .

٩١٩. هەوڵدە لە ژیان کارێك بکەی کە بژمێردرێت ، چونکە بەڕاستی لە نێوان کارێك کە بژمێردرێت و کارێك کە نەژمێردرێت جیاوازیەکی سەرسوڕهێنەر هەیە .

٩٢٠. دەبێت منالەکانمان وا فێرکەین بە چاوکراوەیی خەون ببینن نەك بەچاو داخراوی .

٩٢١. پێویستت بە دۆستێك نەبێت کە بگۆڕێت کاتێك تۆ دەگۆڕێیت ، سەر بلەقێنی کاتێ سەر دەلەقێنی ، گەر وابێت سێبەرەکەت بۆ تۆ باشترین کەسە .

٩٢٢. مرۆڤ پێویستی بە دوو ساڵە تا فێری قسەکردن دەبێت بەڵام پێویستی بە پەنجا ساڵە تا فێری بێ دەنگی دەبێت .

٩٢٣. ئەگەر سەیرێك بکەین دەبینین زۆرترین کتێب لە بازارەکانی ئێمەدا بفرۆشرێت کتێبی دروستکردنی خۆراك و لێك دانەوەی خەونە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە میللەتێکین تەنها دەخۆین و دەخەوینەوە .

٩٢٤. هەرگیز و هەرگیز نەکەیت کەسێك یان شتێك بکەی بە هاوبەش و هاوتای خوای گەورە چونکە بە ئەنجامدانی ئەم کارە مرۆڤ گەورەترین ستەم لە خۆی دەکات .

٩٢٥. رووت وەرمەگێڕە لە خەڵك و بە نازو فیزەوە مەڕۆ بەسەر زەویدا چونکە خوا ئەم جۆرە کەسانەی خۆشناوێت کە وا دەکەن .

٩٢٦. هەرکات گەدەت پڕکرد بیرکردنەوەت نامێنێت و داناییت کەڕ دەبێت و لەشت گشتی سست دەبێت ، وە خۆشی عەقل لەوەدایە کە پڕنابێت و وەك گیرفا نیە سنووری هەبێ.

٩٢٧. هەرگیز تەوبەکردن دوا مەخە چونکە مردن لە پڕێکدا دێت و یەخەت دەگرێت .

٩٢٨. تا پێتان دەکرێت خۆتان بە دوور بگرن لە قەرز ، چونکە قەرزاری دەبێتە هۆی زەلیلی رۆژ و خەفەتباری شەو .

٩٢٩. بەڕێزەوە بڕۆن بۆلای زانایان و بەدڵ گوێیان لێبگرن چونکە دڵ بە زانست ئەبوژێتەوە هەروەك زەوی وشك بە باران زیندوو ئەبێتەوە .

٩٣٠. هەموو کات هەوڵدە ئامۆژگاریەکانت فرمان کردن بێت بە چاکە و نەهی کردن بێت لە خراپە ، وە هەرکات ئامۆژگاریەکانی خۆت جێ بەجێ نەکەیت ئەوا درۆت لەگەڵ خەڵك کردووە ، هەرلەبەر ئەمەشە من بیری خەڵکەکەم دەکەم کەچی ئەوان پیرم دەکەن .

٩٣١. مەبن بە شیرینیەك کە خێرا قوت بدرێن و مەبن بەو تاڵیەش کە تف بکرێنەوە .

٩٣٢. دڵخۆش مەبن بە کردەوەکانتان ئەگەرچی زۆریش بێت چونکە ئێوە نازانن خوای گەورە لێتانی قبول کردووە یان نا بۆیە جارێکیان لە فاڵچیەکیان پرسی خەریکی چی ؟ وتی خەریکم لە گەمژەیی مرۆڤەکان پاروە نانێك پەیدادەکەم چونکە ئەوان لە ژیانی ئەمرۆیاندا گیریان خواردووە و کەچی داهاتووشیان لەمن دەوێت .




٩٣٣. ئەوەندە ئومێدتان بەخوا بێت کە لە سزاکەی ئەمین نەبن ، ئەوەندەش لێی بترسن کە لە بەزەیی و ڕەحمەتی نائومێد نەبن .

٩٣٤. ئەوەندە لەسەریەك هەوڵی فێربوونی زانست مەدە تا کاردەکەیت بەوەی کە فێری بوویت ، وە هەوڵدە منداڵەکانت لە منداڵیەوە فێری زانست بکەیت چونکە فێربوونیان لە گەورەییدا ئەستەمە .

٩٣٥. هەندێ لە کەسایەتیە ئایینیەکان دەیانەوێت ئێمە لە خودا بترسین بەڵام ئێمە نامانەوێت لە خودا بترسین بەڵکو دەمانەوێت خودامان خۆش بوێت چونکە خودا پێش ئەوەی دۆزەخ بۆ بەندەکانی دروست بکات بەهەشتی دروست کردووە ، هەربۆیە ئەوان لەمە تێنەگەیشتوون کە خودا مەترسیدار نیە بەڵکو میهرەبانە ، ئەمەیە ناکۆکی ئێمە و ئەوان .

٩٣٦. هەرگیز کەسی نەفام مەکە بە نوێنەری خۆت ، ئەگەر کەسی زیرەکیشت دەست نەکەوت خۆت ببە بە نوێنەری خۆت .

٩٣٧. ئەگەر گومانت لە مردن هەیە مەخەوە چونکە چۆن دەخەویت ئاواش دەمریت ، وە ئەگەر گومانت لە زیندوو بوونەوەش هەیە هەڵمەستەوە چونکە چۆن لە خەو هەڵدەستیتەوە ئاواش زیندوو دەکرێیتەوە .

٩٣٨. تا ئەوکاتەی بتوانیت نهێنیەکانی خۆت بشاریتەوە و بۆ کەسی نەدرکێنیت ئەوا دڵنیابە هەڕەشەی کەس ناتوانێت بتترسێنێت .

٩٣٩. خۆت سەرقاڵ مەکە بە دونیاوە مەگەر بەو ئەندازەی تێیدا دەژیت ، وە پەروەردگارت بپەرستە بەو ئەندازەیەی کە پێویستت پێیەتی ، وە هەوڵ بۆ دوارۆژت بدە بەو ئەندازەیەی کە تێیدا دەمێنیتەوە ، وە بەو ئەندازەیە گوناه بکە لە دۆزەخ بتوانی بەرگەی بگریت .

٩٤٠. هەرگیز داوا لە کەسانی چروك مەکەن چونکە ئەگەر نەتداتێ گاڵتەت پێ دەکات ، ئەگەر بشت داتێ منەت دەکات بەسەرتەوە .

٩٤١. گەورە ئەو کەسەیە کە بچووکەکان لە بەرامبەریدا خۆیان بە گەورە ببینن .

٩٤٢. هەوڵدە تورەییت بە ئارامگریت و سوکیت بە سەنگینیت و ئارەزووت بە پارێزگاریت و گومانت بە دڵنیایت و ناهەقیت بە هەق و چروکیت بە بەخشندەیت تێك بشکێنیت .

٩٤٣. هەرکەسێك درۆت بۆ بکات دڵنیابە درۆشت بە دەمەوە دەکات .

٩٤٤. هەوڵدە دایك و باوکت لەخۆت ڕازیکەیت چونکە یان بۆت دەبن بە دەرگایەك لە دەگاکانی دۆزەخ یانیش دەبن بە دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت .

٩٤٥. یاسای زێرین لە سەنگینی دا ﴿ هەرشتێك پەیوەندی بەتۆوە نیە وازی لێ بهێنە ﴾ وە ﴿ هەرچی لە دوژمنتی ئەشاریتەوە بۆ دۆستت بەیانی مەکە ﴾ .

٩٤٦. هیچ شتێك نیە هێندەی ﴿ زوبان و دڵ ﴾ پاك بێت بە مەرجێك خاوەنەکەی پاکی ڕاگرتبێت ، وە هیچ شتێکیش لەم دووانە پیسترنین ئەگەر خاوەنەکەی پیسی کردبێت.

٩٤٧. هەرکەس چاکەکانی بژمێرێت بەخشندەیی نامێنێت .

٩٤٨. ئەگەر لە شوێنێك بوویت کە بوون و نەبوونت هیچ جیاوازیەکی نەبوو ئەوا نەبوونت هەڵبژێرە بەمە ڕێز لە بوونت دەگریت چونکە ژیان خەوتنە و خەوتنیش مردنە مردنیش بەئاگاهاتنەوەی مرۆڤەکانە .



٩٤٩. کاتێك یەکێکتان لە چۆڵەوانی دا بینی پرسیاری رێ نیشاندانی لێ مەکەن ، چونکە هەندێ جار بە تەنها بوونی کەسێك لە چۆڵەوانیدا گومانی ئەوەی لێ دەکرێت کە رێگر بێت یانیش شەیتانێك بێت بیەوێ رێتان لێ هەڵەکات .

٩٥٠. با هەزار دۆستت هەبێت هەرچەندە هەزاریش کەمە ، با یەك دوژمنت نەبێت هەرچەندە یەك دوژمنیش زۆرە .

٩٥١. رێزی تۆ بۆ دایك و باوکت تەواو نابێت تاکو رێزی هاورێکانی دایك و باوکیشت بە ئەندازەی ئەوانەوە نەگریت .

٩٥٢. لەکاتی چونت بۆسەر ئاو زۆر مەمێنەوە چونکە زۆرمانەوە لەسەر ئاودا جگەر توند دەکات و پلەی گەرمی لەش بە نا ئاسایی بەرز دەکات .

٩٥٣. لەگەڵ هاورێکانت بەشێوەیەك رەفتاربکە وەك ئەوەی هیچ پێویستیەکت پێیان نیە و ناشتوانیت دەست بەرداریان بیت .

٩٥٤. هەرگیز واز لە هاورێی راستەقینەی خۆت مەهێنە چونکە هاورێی داهاتووت متمانەی پێت نامێنێت .

٩٥٥. هەروەك چۆن پاشاکان وازیان لە دانایی هێناوە بۆتان ئێوەش وازلە دونیا بێنن بۆیان .

٩٥٦. مرۆڤ ئەو کاتە هەوڵ دەدات زۆر قسە بکات کاتێ هیچی پێ نەبێت بیڵێت .

٩٥٧. چەپڵە لێدان باشترین هۆکارە بۆ وەستاندنی ئەو کەسانەی کە قسەدەکەن بێ ئەوەی هەست بە تورەیی بکەن .

٩٥٨. مرۆڤ لەو کاتە زیاتر ماندوو دەبێت کاتێ کە وەستاوە .

٩٥٩. یەکێك لە نیشانەکانی ماڵی بەختەوەر " بێ دەنگە " .

٩٦٠. هەرکەسێك باسی ئەو شتەی بکات کە پێی خۆشە ، خەڵك باسی ئەو شتەی دەکەن کە پێی ناخۆشە .

٩٦١. باشترین ڕێگا بۆ گۆرینی ڕای خێزانەکەت ئەوەیە هاوڕابی لەگەڵی .

٩٦٢. نهێنی لای زۆربەی ئافرەتان وەك ژەهرە ، گەر دەری نەبڕێ دەیکوژێ .

٩٦٣. ئەوکات خۆشترین خەو دەخەوتین کاتێ بمان توانی با خەونەکانمان هەڵبژێرین .

٩٦٤. ئەگەر مرۆڤە لووت بەرزەکان پێیان وایە شتێکیان لە خەڵك زیاترە ئەوا بابزانن زیادەکە دوو پێیە .

٩٦٥. ژیانی ئێوە ئەوکاتە بەرەو باش بوون دەچێت کە خۆتان باش کەن ، وە هەرگیز مەنازن بە بوون و مەگرین بۆ نەبوون هیچیان تا سەر نین هەبوون و نەبوون .

٩٦٦. هەژاری مرۆڤ بەرەو بێ دینی دەبات بەڵام ئەگەر مرۆڤێکی ئارامگربیت لە دونیا ئەوا لە قیامەت لە پێشەوەی دەوڵەمەندەکان دەبێت بۆ چوونە بەهەشت .

٩٦٧. پێش ئەوەی کچەکەت بەشوو دەیت پاش راچاوکردنی ئاین و ئەخلاقی ئەم سێ شتە لە یاد مەکە : کەسەکە دڵ پیس نەبێت ، ڕەزیل نەبێت ، هاوڕێی خراپی نەبێت .

٩٦٨. ئەو کات تەمەنی ڕاستەقینەی ئێوە دەست پێ دەکات ، کاتێ بتوانن جڵەوی چارەنووسی خۆتان بگرنە دەست .

٩٦٩. لە کورتی بالأی ئێمەیە دیوارەکان بەرزن ، لە نەفس نزمی ئێمەشە ناکەسەکان کەسن.

٩٧٠. هەوڵدە بژی بۆ ئەوەی کارێك بکەیت ، نەك کارێك بکەیت بۆ ئەوەی بژی .



٩٧١. ئەو کەسە دەتوانێ کارە مەزنەکان بە سەرکەوتوویی ئەنجام بدات کە بە ووردی بیری لە شتە لاوەکیەکان کردبێتەوە .

٩٧٢. لە ژیاندا لە سێبەرەکان مەترسە ، چونکە لە هەر کوێ سێبەر هەبێت رووناکی لەو شوێنە نزیکە .

٩٧٣. کەسانی گەورە گەورەیی کەسانی تر دەبینن ، کەسانی مام ناوەندیش بەدوای گەورەیی خۆیانەوەن ، کەسانی بچووکیش گەورەیی خۆیان لە سووککردنی کەسانی تر دەبینن .

٩٧٤. درەخت تا زیندوو بێت نابێتە دەسکی تەوور ، کەمردیش ئاساییە .

٩٧٥.ئەگەر بینیت لە ئاسماندا هیچ ئەستێرەیەك نیە ، غەمگین و نا ئومێد مەبە بزانە کە رۆژە .

٩٧٦. منداڵ ئەو فریشتەیە کە هەرچەند دەست و پلی گەورەتر بێت باڵەکانی بچووکتر دەبنەوە .

٩٧٧. هەر کەسێك دەستی درێژکات ناتوانی زمانی درێژبکات .



ئامادەکردنی:
مامۆستا عمر محمود فقی

٩٧٨. لەم رۆژگارە هەرچەند دکتۆر زۆر بێت تەندروستی خەڵك کەم دەبێت ، وە هەرچەند پارە زۆربێت نرخی مرۆڤ کەم دەبێت ، وە هەرچەند بڕوانامە زۆر بێت خەڵك زیاتر نەخوێنەواری مەعریفەت دەبن .

٩٧٩. دەتوانی ماڵەکەی خۆت بکەیت بە مزگەوت بە زیندوو کردنەوەی نوێژەکان تیایدا .

٩٨٠. هەرکات ویستت بێ ئەمری خـوا بکەیت ئەوا ئەم کارە لە شوێنێك بکە کە ئەو نەتبینێت .

٩٨١. بۆ بەسەر بەرزیەوە داوا لەو کەسە ناکەیت کە گشت جیهانی بەدەستە ؟ بۆ بە شەرمەوە لەو کەسە داوا دەکەیت کە هیچی بەدەست نیە ؟! .

٩٨٢. خەڵکان نووستون بەمردن بەئاگادێن ، وە ئەوکاتەی بەئاگادێن خۆزگە دەخوازن ئەو کاتیش خۆزگە سوودی نابێت .

٩٨٣. هەرکات ویستت سوپاس گوزاری زانستێك بیت ئەوا کاری پێ بکە ، وە هەرکات ویستت سوپاسگوزاری کارێك بیت ئەوا زانستی زیاتری لێ فێربە .

٩٨٤. هەموو فیرعەونێك دروستکراوی نەوەکەیەتی .

٩٨٥. هەرچەند وریای ئەم جۆرە کەسانەبیت هەر کەمە ﴿ جو ، شیعە ، مەدخەلی ﴾ .

٩٨٦. هەرکەس بزانێ قسەکانی لە کردەوەکانیەتی ، کەم قسە دەکات .

٩٨٧. دوورکەونەوە لەو کەسانەی کە سیحر دەکەن یان بۆ لای سیحربازان دەچن چونکە گشتیان دۆڕاون .

٩٨٨. هەژارەکان لەترسی هەژاریدا بوون بە هەژار ئەگینا دەوڵەمەندن .

٩٨٩. هەرشتێك بە ئاسانی بەدەست بێت ، بە ئاسانیەکی زیاتریش لە دەست دەچێت .

٩٩٠. مرۆڤە سەرکردەکان لە پێنج کاتژمێر زیاتر ناخەون ، مرۆڤە دۆڕاوەکانیش زۆر دەخەون بەهۆی ماندووبونیانەوە .



٩٩١. ڕێگا جیاوازەکانی ژیان تاقیبکەرەوە چونکە ئەگەر عەباسی کوڕی فەرناس نەکەوتبایە خوارەوە ئەوا ئیمرۆ فرۆکە نەدەفڕی .

٩٩٢. وا بیرکەوە تۆ لە قۆناغی دوای مردنیت حەز دەکەیت بۆ دونیا بگەڕێیتەوە چیت دەکرد ؟! ئێستا بیکە باشترە چونکە ناگەڕێیتەوە بەلاّم بەداخەوە کە لە ڕۆژگارێکدا دەژین ئەوەی بمرێت دەڵێن ئیسراحەتی کرد .

٩٩٣. هەرکەسێك بیەوێت گەدەی پڕکات بێ ئەوەی عەقل و ڕۆحی پڕ بکات وەك ئەو جوتیارەیە کە لەناو زەریادا تۆو بکات .

٩٩٤. هەرکات لە کەسانی پێش خۆتەوە فێربوویت ، لە تەمەنێکی پێش تەمەنی خۆت ژیان بەسەر دەبەیت .

٩٩٥. بۆ ئەوەی بزانی تۆ دەبیت بە سەرکردە یان نا ؟ بزانە تاکو ئێستا ئامانجەکانت وەك نووسراو نووسیوەتەوە یان نا ؟ ئەگەر بەڵێ : پیرۆزە گەورەم ، ئەگەر نەخێر : هەر ئێستا بینووسەوە و کاری بۆ بکە .

٩٩٦. تەمەنی تۆ پەیوەستە بە بەرهەمەکانت ، جا چەند دەتەوێ بژی .

٩٩٧. ئەگەر هەرگیز نەکەویت چۆن فێری هەڵسانەوە دەبیت ؟! .

٩٩٨. مرۆڤی زیرەك قسە دەکات ، زاناش گوێ دەگرێ بەلاّم مرۆڤی ژیر تێ دەفکرێ .

٩٩٩. خەون بەوە ببینە هەروەك ئەوەی هەتا هەتایە دەژیت ، بژی هەروەك ئەوەی ئەمرۆ دەمریت .

١٠٠٠. وریابە زۆر جار کەسێك دەخەیتە سەر چاوت کەچی کوێرت دەکات ، هەندێ جاریش کەسێك دەخەیتە ژێر پێت کەچی بەرزت دەکات .

١٠٠١. ژنانیش وەك پیاوان دەتانن نهێنیەکان بپارێزن بەلآم بۆیە بەیەکتر دەڵێن تاکو لە پاراستنیدا هاوبەش بن ! .

١٠٠٢. لە دونیا شتێك بڵێ کە لە قیامەتدا جورئەتی ووتنەوەیت هەبێت .

١٠٠٣. هەرگیز لە مرۆڤی درۆزن مەپرسە بۆچی درۆت کرد چونکە بە درۆیەکیتر وەڵامت دەداتەوە .

١٠٠٤. درۆزنترین مرۆڤی ئەم جیهانە بە درێژایی گشت تەمەنی هێندەی بچووکترین سیاسەت مەدار درۆی نەکردووە .

١٠٠٥. هەرکات ویستت دایکت دڵخۆش بکەیت قسەی لەگەڵدا بکە بەلآم ئەگەر ویستت باوکت دڵخۆش بکەیت گوێی لێ بگرە .

١٠٠٦. ئەگەر پارەیەك بە فێڵ دەست کەوێ ، یان دکتۆر ئەیبات یان لێت ئەگەوێ .

١٠٠٧. ئەگەر هەر کەسێك بەقەد زانستی خۆی قسەی بکردایە ئەوا دونیا بێ دەنگ دەبوو

١٠٠٨. هەوڵدە تا دەتوانی سوێند مەخۆ ، ئەگەر سوێندیشت خوارد بە خوا بیخۆ یان بە قورئان چونکە ئەویش کەلامی ئەوە ، وە هەرگیز نەکەیت سوێند بە هیچ شتێکیترەوە بخۆیت وەك شەرەف و گۆڕ و فلآن ، جگە لەم دووەی باسم کرد چونکە شەیتان بە شەیتانی خۆی سوێندی بە عیزەتی خوا خوارد مەگەر تۆ لە شەیتان شەیتان تری ؟! بۆیە بە سوێند خواردن متمانەت لەدەست دەدەیت چونکە مرۆڤی ڕاستگۆ پێویستی بە سوێند خواردن نیە .

١٠٠٩. سوالکەر هەرچەند زیاتر ملی لارکاتەوە هێندە زیاتر درۆدەکات .



١٠١٠. عـيشـق وەكو دەسـت نوێژ وایە كە گـومانت لێ هەبوو دەشـكێت .

١٠١١. لە یادت بێت كە كتێبی ژیان چاپی دووەمی نیە ! بۆیە بۆ جارێكیش بێت بە ژیرانە چاپی بكە .

١٠١٢. هەركات باوێشكت هات ئەگەر دەستی ڕاستت بەكارهێنا ئەوا لەپی دەستت بخە سەر دەمت ، ئەگەر دەستی چەپیشت بەكارهێنا پشتی دەستت بخە سەر دەمت .

١٠١٣. بەنهێنی ئامۆژگاری هاورێكەت بكە و بە ئاشكراش مەدحی بكە .

١٠١٤. زۆرجار كڕینی ئەو شتانەی كە پێویستت پێی نیە دەبێتە هۆی فرۆشتنی ئەو شتانەی كە پێویستت پێیەتی .

١٠١٥. هەرگیز قووڵی ڕووبارەكان بە پێكانت تاقیمەكەوە .

١٠١٦. ڕۆژێ بۆ ماوەی ( ٢٠ ) خوولەك لەگەڵ منداڵەكانت ئاخاوتن بكە ، لەم ( ٢٠ ) خوولەكەش با ( ١١ ) خوولەك بۆ گوێگرتن بێت لە بیروڕایان چونكە ئەوان بە ئامۆژگاری ئێمە گەورەنابن هێندەی بە گوێگرتن لێیان گەورە دەبن .

١٠١٧. سەركەوتووترین بەڕێوەبەر ئەو كەسەیە كە زۆربەی كاتەكانی لە ئەرزی مەیدانی دا بەسەر دەبات نەك لە ژوورەكەی خۆی ، وە كار بۆ كەسانی خوارەوەی خۆی دەكات نەك سەرەوە .

١٠١٨. پێش ئەوەی بچیت بۆ گەشتێك یان سەفەرێك خەوێکی چاك بکە و هەوڵدە لە شەودا بەرێ کەویت چونکە ڕێگا بە شەو کورت دەبێت ، وە پێش ئەوەی دابەزیت بڵێ خوایە لە شوێنێکی پیرۆز دامبەزێنە و پێش ئەوەی پشوو بدەیت دوو رکاعەت نوێژ بکە و پێش ئەوەی شوێنەکەش جێ هێڵیت دووبارە دوو رکاعەت نوێژیتر بکە و سوپاسی خوابکە .

١٠١٩. هەندێ جار خۆدانە بەر ئاوی باران لە چاوزاری و سیحر و نزیك بوونەوەی شەیتان دەتپارێزی هەروەك لە سورەتی ئەنفال ئایەتی یانزە دا باسکراوە .

١٠٢٠. لەوانەیە فەیلەسوفێك بتوانێ وولاتێك لەسەرەوەی هەوردا دروست بکات ، وە شاعیرێك بتوانێ بە شیعرەکەی وولاتێك لە ژێر ئاودا دروست بکات بەلآم مرۆڤی ژیر وولاتێك دروست دەکات کە ڕەگەکەی لە ژێر ئاودا بێت و لقەکانی لەسەرەوەی ئاسمانەوە بێت .

١٠٢١. مرۆڤەکان زۆر سەیرن : کاتێ منالین پێمان دەڵێن تێناگا ، کاتێ گەنجین دەڵێن گەنج مێشکی خاوە ، کاتێ گەورە دەبین دەڵێن ئەوە بەرەو پیری دەروات تێناگا ، کاتێ پیر دەبین دەڵێن خەڵەفاوە ، تەنها کاتێ کە دەمرین دێنە سەر گۆڕەکەمان دەڵێن بەراستی کابرایەکی عاقل بوو !!! .

١٠٢٢. ئاسن کاتێ کە بەکارنێت ژەنگ هەڵدێنێ ، ئاو کە وەستا بۆگەن دەبێت ، مێشکی ئێمەش هەروایە ئەگەر هاتوو بیرنەکەینەوە .

١٠٢٣. ناتوانی بەردێك بگریتەوە پاش هەڵدانی ، ناتوانی ووشەیەك بگەڕێنیتەوە پاش درکانی ، ناتوانی چانسێك بێنیتەوە پاش لەدەست دانی ، ناتوانی گەنجیت بێنیتەوە پاش پیربوونی ، ناتوانی کاتت زیادکەیت پاش وەستانی ، بۆیە بزانە پێش ئەوەی چاوەڕێی دروێنەی بەرهەمێك بکەیت بزانە چی دەچێنیت .




١٠٢٤. ئێمە هەرچی بکەین ناتوانین رۆژێك بۆ ژیانمان زیاد بکەین بەلاّم دەتوانین ژیانێك بۆ رۆژەکانمان زیاد بکەین .

١٠٢٥. کاتێك کە بە پەنجەی گومان ئاماژە بۆ کەسێك دەکەیت کە تاوانبارە ، ئەوە بزانە سێ پەنجەکەی تر ئاماژە بە خۆت دەکات .

١٠٢٦. هەر کەسێك نرخی خۆی نەزانێت ئەستەمە نرخی کەسانیتر بزانێت .

١٠٢٧. ئەگەر لێکخشاندنی دەستەکان گەرمی دروست بکات ، ئەوا لێکخشاندنی عەقلەکان ژیری دروست دەکات .

١٠٢٨. فرمێسکەکانی مرۆڤ دڵۆپەنین ، بەڵکو ووشەی شاراوەن ئەو کات دێنەخوار کە کەسی بەرامبەر نەتوانێ لە ووشە شاراوەکانت بگات .

١٠٢٩. هیچ کات بە گەورەییت رێز بەدەست مەهێنە ، هەوڵدە بە رێزت گەورەیی بە دەست بێنیت .

١٠٣٠. هەرچەند دوژمنت گەورەبێت لێی مەترسە و بەوچاوە سەیریکە کە دەتوانی زۆرترین هێزی لێ بەرجەستە کەیت ، بزانە کە کۆلارە سوود لە بای پێچەوانە وەردەگرێ بۆ فڕین نەك بای هاوتەریب .

١٠٣١. قەت مەڵێ خوایە خەمێکی گەورەم هەیە بەڵکو بڵێ ئەی خەم خوایەکی گەورەم هەیە .

١٠٣٢. ئەگەر ویستت ئایندەی میللەتێك بزانیت ئەوا تەماشای ئەو کتێبانە بکە کە دەیخوێننەوە و سەیری ئەو فلیمانەش بکە کە سەیری دەکەن .

١٠٣٣. هەرکەسێك کتێبێکی بەسوود لەناو ببات وەك ئەوەیە مرۆڤێکی لەناو بردبێت بۆیە سزای لە چواردارەدان بۆ ئەو گونجاوە نەك لە سێدارەدان .

١٠٣٤. سەیری مرۆڤی ژیر بکەن کاتێ لە بەرامبەر کۆشکێکی مەزن دەوەستێ بیرلە دەرگای کۆشکەکە دەکات کە چەندە سادەیە ، وەکاتێ سەیری دەرگاکە دەکات هەرچەندە مەزنیش بێت بیرلەوە دەکاتەوە کە کلیلی کردنەوەی دەرگاکە چەندە بچووکە ، بەمە فێردەبیت کە هەموو گرفتێکی گەورە چارەسەرێکی بچووکی هەیە جا ژیربە بیدۆزەوە

١٠٣٥. ئێمە بە دەگمەن بیر لەوشتانە دەکەینەوە کە هەمانە بەڵام هەمیشە بیرلەوە دەکەینەوە کە نیمانە ، بیرکردنەوەت پێچەوانەکە ژیان بەدەست دێنی .

١٠٣٦. بەداخەوە چاوەکانی مرۆڤ هەرچەند گەورەبێت ناتوانن خۆیان ببینن عەیبەکانیشی بەم شێوەیەن .

١٠٣٧. ئەو کەسەی لەسەر کورسیەکەی خۆی دانیشتووە و باس لە گۆرینی جیهان دەکات هیچ شتێکی پێ ناگۆردرێت جگە لە ﴿ پامپێرز ﴾ نەبێت ، کە جۆرێکە لە حەفازە !

١٠٣٨. سەیرکردنی فلیمە کۆمیدیە کۆنەکان مانای کۆمیدیا ناگەینێت بەڵکو مانا ڕاستەقینەکەی ئەوەیە کە ئێمەی مردووی بەناو زیندوو بە مردووەکان پێ دەکەنین کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا تراژیدیایە نەك کۆمیدیا .

١٠٣٩. هەرکەسێك لە خوێندن بوەستێت پیرە جا بیست ساڵ بێت یان هەشتا وە هەوڵدە هەردەم بۆخۆت دونیاییێکی ترت هەبێت بۆ ژیان .



١٠٤٠. متمانە بەو کەسە مەکە کە نایناسی تا دەیناسی ، وە متمانە بەو کەسەش مەکە کە دەیناسی تاکو تاقی دەکەیتەوە .

١٠٤١.ئەگەر واتای پێچەوانە نەبوایە ئەوا ﴿ واتا ﴾ واتای نەدەبوو ، ئەگەر خۆشی نەبوایە ئەوا ناخۆشی واتای نەدەبوو ، بۆیە ئەگەر مردن نەبوایە بێگومان ژیانیش تامی نەدەبوو .

١٠٤٢. ئەگەر کەسێکت خۆشویست لەبەر ئەوەی جوانە بزانە ئەمە خۆشەویستی نیە بەڵکوئەمە ﴿ شەهوەتە ﴾ ، وە ئەگەر کەسێکت خۆشویست لەبەر ئەوەی زیرەکە بزانە ئەمە خۆشەویستی نیە بەڵکو ئەمە ﴿ سەرسامیە ﴾ ، وە ئەگەر کەسێکت خۆشویست لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندە بزانە ئەمە خۆشەویستی نیە ئەمە ﴿ مادیەتە ﴾ ، وە ئەگەر کەسێکت خۆشویست نەتزانی بۆچی خۆشت دەوێت بزانە ئەم خۆشەویستیە ﴿ حەقیقەتە ﴾ ، بۆیە لەیادت بێت کە خۆشەویستی یاری نیە بەڵام بەداخەوە کە یاریزانی زۆرە .

١٠٤٣. متمانە بەهیچ چەپکە کلیلێك مەکە بەڵکو خۆت فێری کلیل سازی بکە .

١٠٤٤. مرۆڤی لووت بەرز وەك ئەو کەسە وایە کە لە بەرزی شاخێکەوە وەستا بێت و هەموو کەسێك بە بچووکی ببینێت بێ ئەوەی هەست بکات کە گشت خەڵك زیاتر ئەو بە بچووکی دەبینن نەك خۆیان .

١٠٤٥. هەرکات خەڵك قسەیەکی خراپیان پێ ووتی یەکسەر لەسەر کاغەزێك تۆماری بکە و بیخە ژێر پێتەوە و رۆژێك دێت هەست دەکەیت کە تۆ بە سایەی ئەوانەوە زۆربەرز بوویتەوە ، بۆیە سوپاس گوزاریان بە .

١٠٤٦. ئەستەمە تەمەنی مرۆڤ بگاتە سەد ساڵ ، کەچی خەمی هــەزار ساڵ دەخــوات .

١٠٤٧. هەرگیز گاڵتە بە خەونی کەس مەکە هەرچەند سەیروسەمەر بێت ، دەست بەرداری خەونی خۆشت مەبە هەرچەند ئەستەم بێت چونکە ژیان بێ خەون تامی نیە .

١٠٤٨. ئەگەر ســەگێکت تێرکرد ناتگەزێ ، ئەمەیە جــیاوازی نێوان ئەو و مرۆڤـەکان .

١٠٤٩. جارێك بچووك دەمبینی و جارێك گەورە ، کەچی نەبچووکم نە گەورە ئەوە تۆی خۆت بەرز و نزم دەکەیت .

١٠٥٠. ئەگەر پێشکەوتن و رۆشەنبیری بە رووت و قوتی بوایە ئەوا ئەو گیاندارانەی کە رووتن دەبوونە رۆشەنبیرترینمان .

١٠٥١. زۆر رێزی پوورت بگرە چونکە وەك دایك وایە بەتایبەتیش خوشکی دایك وە هەرکەس دایك و باوکی خۆی خەمگین بکات ئەوا سزای داون .

١٠٥٢. درۆزنترین کەس لای قوتابی ئەو مامۆستایەیە کە هیچ زانستێکی وای فێری قوتابیەکانی نەکردووە و لە تاقیکردنەوەش دا قورسترین پرسیار دێنێ و لە کۆتایش دا دەنووسێ ﴿ بە هیوای سەرکەوتن ﴾ .

١٠٥٣. سەربەرزترین بە چونکە هیچ شتێك لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام دا نیە مایەی شەرمەزاری بێت .

١٠٥٤. هەموو مرۆڤێك کارامەیە ، بەڵام ئەگەر تۆ بڕیاری بێ توانایی لەسەر ماسیەك بدەیت بەوەی کە ناتوانێ سەر دار بکەوێ ئەوا تۆ کارامەیی مەلەکردنت لە ماسیەکەدا کوشت .




١٠٥٥.  خوای گەورە لە رۆژێکدا ﴿ ٨٦٤٠٠ ﴾ چرکەی بۆ تۆ داناوە ، ئایا تۆ لەم هەموو چرکەیەدا چەندت بۆ ئەو داناوە ؟!

١٠٥٦.  کاتەکانمان تێپەراند بۆئەوەی بگەین بە خۆشی ، کاتێك گەیشتین هەستمان کرد خۆشی ئەوە بوو کە بەجێمان هێشت .

١٠٥٧.  ژیانی هاورێکەت بکە بە چوار بەشەوە : ئەگەر ئەو لە تۆ زیرەکتربوو ئەوا ببە بە قوتابی ئەو ، وە ئەگەر تۆ لەو زیرەکتری ببە بە مامۆستای ئەو ، ئەگەر هەردووکتان نەزان بوون بەدوای مامۆستایەك بگەرێن بۆخۆتان ، ئەگەر هەردووکیشتان زانان پێشبرکێ بکەن لەوەی کامتان زیاتر زانست دەبەخشن و سوودتان لێ دەبینرێت .

١٠٥٨.  ئێمەی کورد خاوەنی سێ شتین کە لە دونیادا وێنەی نیە ﴿ کلاشی پەڕۆینمان هەیە ڕاست و چەپی نیە ، شەڕوالی کوردیش پێش و پاشی نیە ، بنێشتی کوردیش گلۆپی نیە ﴾ .

١٠٥٩.  ئەگەر خوای گەورە شتێکی لێ سەندیەوە کە چاوەرێت نەدەکرد لەدەستی بدەیت ، ئەوا شتێکت پێ دەبەخشێ کە چاوەرێ ناکەیت بەدەستی بێنی .

١٠٦٠. ئەگەر شتێکت ویست پاشان دۆزیتەوە ئەوە ﴿ قەدەرە ﴾ ، وە ئەگەر شتێکت ویست پاش چاوەڕوانی بەدەستت هێنا ئەوە ﴿ ئارامگریە ﴾ ، وە ئەگەر شتێکت ویست پاشان شتێکی لەو کەمترت دەست کەوت و رازی بوویت ئەوە ﴿ خۆشەویستیە ﴾ بەلاّم ئەگەر شتێکت ویست و چاوەڕێت کرد پاشان بە شتێکی لەو کەمتریش رازی بوویت ئەوە ﴿ ژیـــانە ﴾ .

١٠٦١. هەرگیز لە دەنگی ئەو گوللەیە مەترسە کە دەیبیستی چونکە ئەگەر بڕیار بوایە بتکوژێت ئەوا گوێ بیستی دەنگی نەدەبوویت .

١٠٦٢. هەرکەسێك تۆی فرۆشت تۆ مەیفرۆشە چونکە هیچ ناکات .

١٠٦٣. زۆربەی کۆمەڵگاکان دابەش دەبن بۆ دوو جۆرە کەس : ئاقڵە بەدبەختەکان و گەمژە خۆشبەختەکان .

١٠٦٤. قەت روخسارت مەگۆرە بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەت ڕازی بکەیت چونکە ئەگەر بەڕاستی خۆشیان بوێیت ئەوا بە سروشتی خۆت قبوڵت دەکەن .

١٠٦٥. دڵ تەنگ مەبە بەوەی ئەگەر چەند هەنگاوێك لە ژیان بۆ دواوە گەڕایتەوە ، چونکە کاتێ تیرکەوان بۆ دواوە دەگەڕێتەوە دوو هێندە بەرەو پێش دەچێت .

١٠٦٦. هەرکات هەژارێکت لە وولاّتی موسوڵمانان بینی بزانە کە دەوڵەمەندێك دزی لێکردووە .

١٠٦٧. لە گشت مێژووی ئیسلامەتی دا تەنها شەش کەس هەبوون لێکدانەوەی خەون بۆ خەڵك بکەن ، کەچی ئێستا لە هەر کۆلاّنێك دە کەس هەیە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کە میللەت زۆربەیان خەوتوون و کەمیان بە ئاگان .

١٠٦٨. ئەگەر کەسێك هاوڕا نەبوو لەگەڵتا مانای وانیە کە دوژمنتە بەڵکو وەك رەخنەگرێك قبوڵی بکە ، چونکە ئەمانەن مرۆڤ بنیات دەنێن .

## ( ١١١١ ) ئامۆژگاری زێڕین بۆ نەوە سەرکردەکان



١٠٦٩. لە رۆژگاری ئێستادا جینۆسایدی میللەتان بوە بە جیهاد ، وە دزینی سامانی خەڵك بۆتە زەکات ، وە سەربازەکان بون بە نەوەی ﴿ بن بازەکان ﴾ لە دەرکردنی فەتوادا .

١٠٧٠. وەك ئەو مریشکە مەبە کاتێ بیەوێت هێلکەیەك بکات دونیا دێنێتە قارەقار کەچی لەهەمان کات ماسی ناو دەریا بە هێمنی هەزاران هێلکەی پڕ لە کافیار دەردەکات و دەنگیشی لێوە دەرناچێت .

١٠٧١. گەر وەکو مانگا گەورە و گران بیت ئەوا ئەتدۆشن ، ئەگەر وەك هێستر بەهێزبیت ئەوا بارت پێ هەڵدەدەن ، ئەگەر جوان بیت بەکارت دەخەن ، ئەگەر وەك ئەسپ خێرا بیت ئەوا پێش برکێت پێ دەکەن ، ئەوان نە لە گەورەییت و نە لە بەهێزیت و نە لە جوانیت و نە لە خێراییت ئەترسن ، ئەوان تەنیا و تەنیا لە هۆشیار بوونت ئەترسن !

١٠٧٢. ئەگەر ووتیان دارشتنێك لەسەر ﴿ هـــیوا ﴾ بنووســـە هەزار ووشە بێت ، ئەوا ﴿ ٩٩٠ ﴾ ووشە بە بەتاڵی جێ هێڵە و لە ریزی کۆتایی بنووسە ﴿ هیوا کۆتا شتە کە بمرێت ﴾ .

١٠٧٣. من و تۆ هەردووك زادەی یەك خاکین ، بۆ تۆ حاکم و من ئاشەوان بم ؟ ئەگەر لای دوژمن هەردووك مەکروهین ، چۆن تۆ وەزیری و من پاسەوانم !

١٠٧٤. لە پشتی هیچ مرۆڤێکەوە ئەو شتە مەڵێ کە ناتوانیت لەبەر دەمیدا بیڵێیت .

١٠٧٥. ڕاستی وەك تەمەن وایە هەرچەند بیشاریتەوە هەر خۆی دەردەخات .

١٠٧٦. گەورەترین دەست کەوت و سامانی حکومەتەکان ئەوەیە کە میللەت بیرنەکاتەوە .

١٠٧٧. زۆر کەس وا بیردەکاتەوە کە پیاوە تەنها لەبەر ئەوەی کە ئافرەت نیە !

١٠٧٨. هەندێ جار بۆئەوەی جەستەت ئازاد بێت دەبێ زمانت زیندانی بکەیت .

١٠٧٩. لات ئاسایی بێت کە یاسا وەك داوی جاڵجاڵۆکە وایە تەنها دەتوانێت مێشە بچکۆڵەکان ڕاو بکات ، هەرکات شتی گەورە بگرێت خۆی لەناو دەچێت .

١٠٨٠. هەرکات هەستت بە ئازار کرد ئەوا تۆ زیندووی ، وە هەرکات هەستت بە ئازاری کەسانی تر کرد ئەوا تۆ مرۆڤی .

١٠٨١. بەپێی ئەزموونی کەسانی ژیر لە ژیاندا تەنها دوو ڕێگە هەیە بۆ سەرکەوتن ﴿ یەکەم : ئەوەیە هەرگیز خۆت بەدەستەوە نەدەیت ، دووەمیش : ئەوەیە کە سوربیت لەسەر ڕێگای یەکەم ﴾ .

١٠٨٢. هەرکات کاتێکی زیاد لە پێویست تەرخان بکەی بۆ بیرکردنەوە لەو کارەی کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت ، ئەوا هەرگیز ناتوانی کارەکە ئەنجام بدەیت .

١٠٨٣. ئێمە دروست نەبووین تا بمێنینەوە ، بۆیە شتێك لە دوای خۆت جێ بهێڵە تا هەست بە بوونت بکرێت .

١٠٨٤. شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە بەوە بناسە کە دوژمن لە گۆڕەکەشی دەترسێت .

١٠٨٥. گرفتی نەوەکانی ئێمە لە بەفیڕۆدانی ساڵانی رابردوومان نیە بەڵکو لە بێ پلانی ساڵانی داهاتووە .

١٠٨٦. هەر شتێك بە توڕەییەوە دەست پێ بکرێت بە شەرمەزاری و داوای لێ بووردنەوە کۆتایی دێت .

١٠٨٧. هەرگیز لە دوو کەس نزیك مەبەرەوە : لە ئافرەتێك هەموو سامانەکەی جوانی بێت ، وە پیاوێك هەموو جوانیەکەی سامان بێت .



١٠٨٨. بەختەوەری مانای نەبوونی کێشە نیە ، بەڵکو مانای خۆ گونجاندنە لەگەڵ کێشەکان .

١٠٨٩. وانەزانی کە پیربوویت عەشق وازت لێ دێنێ ، چونکە دار هەرچەند ووشك بێت ئاگر باشتر دەیسوتێنێ .

١٠٩٠. ڕاستگۆبە چونکە ڕاستگۆیی ڕزگارت دەکات هەرچەندە لێی بترسی ، دوورکەوە لە درۆ چونکە درۆکردن ئابرۆت دەبات هەرچەندە لێی دڵنیا بیت .

١٠٩١. هەرکات بەسەر شۆری رازی بیت ، هەرشتێك بیت مرۆڤ نیت .

١٠٩٢. هیچ شتێك نیە هێندەی گفتوگۆی ژنێکی تێگەیشتوو جوان بێت .

١٠٩٣. ئەوکات بەرزی پایەی تۆ دەردەکەوێت کاتێ خراپەیەکت بەرامبەر کرا تۆ بە چاکە وەڵامیان دەیتەوە .

١٠٩٤. گەورەترین هەڵە کە ئێمەی مرۆڤ دەیکەین لە پەیوەندیەکاندا ئەوەیە کە گوێگرتنمان نیوەیە ، تێگەیشتنمان چارەگێکە ، بیرکردنەوەمان صفرە ، کاردانەوەشمان دوو هێندەیە .

١٠٩٥. هەرکات پارەت لەدەست بوو بیرت دەچێت کە تۆ کێیت ، بەڵام کاتێ پارەت لەدەست نەما خەڵك بیریان دەچێت کە تۆ کێیت .

١٠٩٦. گەورەیی ئاینی ئیسلام بەوە بناسە کە پێش ئەوەی ئاینی ئیسلام دەستی دزەکان ببڕێت سکی برسیەکان تێر دەکات .

١٠٩٧. هەوڵمەدە ئەوەندە بەلاتەوە گرینگ بێت خەڵك لێت تێبگەن ، لەوە گرینگتر ئەوەیە هەوڵدەیت لە خەڵك تێبگەیت و ناخیان بخوێنیتەوە .

١٠٩٨. هەرکات مامۆستایەك نەیتوانی قوتابیەکانی لە بابەتێك تێبگەینێت ئەوا خۆی لەبابەتەکەیدا تێنەگەیشتووە ، چونکە هەموو شتێکی زەحمەت بە تێگەیشتن ئاسان دەبێت وە هەموو شتێکی ئاسانیش بەبێ تێگەیشتن زەحمەت دەبێت .

١٠٩٩. پێویستە مرۆڤ وانەیەك لە ئامێری پیانۆ فێربێت کە دوگمەکانی ڕەش و سپین ، خۆشیەکانی دوگمە سپیەکانن ناخۆشەکانیشی دوگمە ڕەشەکانن ئەمەش بزانە بەبێ بەژداری هەردوو دووگمە ناتوانی ئاوازێکی خۆش بژەنی .

١١٠٠. لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا چوار جۆرە دەست هەیە : یەکەم دەست ئەو دەستەیە کە نەزانە دەبێ دەوڵەت فێرە کاری بکات ، دووەم دەست تواناداره و بێ کاره دەبێ دەوڵەت کاری بۆ بدۆزێتەوە و کاری پێ بکات ، سێیەم دەست ئەو دەستەیە کە کاردەکات و وولات ئاوەدان دەکاتەوە و ژینگە خاوێن دەکات دەبێ دەوڵەت ڕێزی لێبگرێت و پاداشتی بکات ، چوارەم دەستیش ئەو دەستەیە کە دزە و خیانەتکارە دەبێ دەوڵەت بیبڕێ و بنبڕی بکات ئەگەرچی دەستی خۆشی بێت .

١١٠١. بیرکەوە بۆچی مرۆڤ لەکاتی لەدایك بوونی دا بانگ لە گوێی ڕاستی دەدرێت و قامەتیش لە گوێی چەپی دەکرێت ؟ بەڵام ئەو کات نوێژی لەسەر دەکەن کە دەمرێت ؟ چونکە ئێمە هەرچەند لەم دونیایە بژین کۆی تەمەنمان یەکسانە بە ماوەی نێوان بانگ و قامەت و نوێژەکە و زیاتر نیە .



۱۱۰۲. ئامۆژگاریەك لەوانەی بیرکاری فێربووم کە ژیان بریتیە لە ﴿ + و − و ٪ ﴾ واتە : هەوڵدەم هاورێ خۆشەویستەکانم کۆکەمەوە و لوت بەرزی و لەخۆبایی بوون لە خۆمدا کەم بکەمەوە و خۆشەویستیشم بەسەریان دا بە یەکسانی دابەش بکەم .

۱۱۰۳. جەنگی سارد : ئەو جەنگەیە کاتێك ئافرەتێك بەلووت بەرزیەوە بەرووی ئافرەتێکیتردا خەندە بکات .

۱۱۰٤. ئامۆژگاریەك لە شێتەوە فێربووم : بینیم شێت ئەقلی نیە تا بیرکاتەوە بەڵام زانیم لە شێت شێتتر ئەو کەسەیە کە ئەقلی هەیە و بیرناکاتەوە .

۱۱۰٥. زانست سێ ئاستە : هەرکات مرۆڤ گەیشت بە ئاستی یەکەم لوت بەرزدەبێت و هەست دەکات کە تەنها ئەو زانایە ، وە هەرکات گەیشت بە ئاستی دووەم ملکەچ و گوێ رایەڵ دەبێت و رەخنە وەك دیاری قبووڵ دەکات ، وە هەرکات گەیشت بە ئاستی سێیەم ئینجا هەست دەکات کە نەزانترین کەس بووە و نەزانترین کەسیشە .

۱۱۰٦. گەشبین بە لە ژیان و زۆر قورئان بخوێنە چونکە مرۆڤ وەك ئەڵقەی نێوان قورئان و گەردوونە ، هەر لەبەر ئەمەشە قورئان گەردوونێکی دەنگدارە و گەردوونیش قورئانێکی بێ دەنگە .

١١٠٧. چۆن زانا لە نەزان جیادەکەیتەوە ؟ هەموو زانایەك ئەزانێ کە نەزانە بەڵام نەزان وا ئەزانێ زانایە ، هەرکات زانا هەستی کرد زانایە ئەوکات نەزانە ، وە ئەگەر نەزان هۆی نەزانینی خۆی زانیبا بەدڵنیاییەوە دەبوو بە زانا ، ئەو زانستەی کە زانا دەیزانێت دڵۆپێکە و ئەوەی نایزانێت ئۆقیانۆسێکە چونکە دوو جۆرە کەس کۆمەڵگا لەناو دەبەن یەکێکیان نەزانێت و قسەبکات ئەویتریش بزانێت و قسە نەکات ، وە هەرکات لەگەڵ زانایەك قسەت کرد بە ژیرانە قسە بکە بەڵام ئەگەر لەگەڵ نەزانێك قسەت کرد بە ژیرانە بێ دەنگ بە ، دەڵێن هەموو کەم زانێك نەزانە بەڵام مەرج نیە هەموو زۆر زانێك زانابێت ، وە هەرکەس هەست بە نەزانینی خۆی بکات لە هەموو کەس زاناترە بۆیە زانا بە مردوویش هەر زیندووە بەڵام نەزان بە زیندوویش هەر مردووە .

١١٠٨. هەوڵدە لە ژیان بە نەرمی ڕەفتار لەگەڵ دەوروبەرتدا بکەیت و ڕێگە بەخۆت نەدەیت تووڕەیی بەسەرتدا زاڵ بێت چونکە ئاگر بە هەموو هێز و تینیەوە ناتوانێ ڕەگی درەخت بسوتێنێ کەچی ئاو بە هەموو نەرمیەوە درەخت لە ڕەگەوە دەردێنێت .

١١٠٩. بیرم دێت پێیان دەوتم ئەگەر بە سەربازی دەست پێ بکەیت لە کۆتایی دەبیت بە ژەنەڕاڵ ئەوەتا بە مامۆستایەتی دەستم پێکرد بە مام وەستایەتی کۆتایی پێ دێنم .

١١١٠. سوپاس بۆ خوا ﴿ 1110 ﴾ ئامۆژگاریم نووسیەوە کەچی تا ئێستا دەستم بە نووسینەوەی هیچ ئامۆژگاریەك نەکردووە ، بۆیە حەز دەکەم بە دێڕێك واتای ئەو شتە دەربڕم کە خەڵکان بە کتێبێك دەری دەبڕن ، وە لە کۆتاییدا دەڵێم ئەوە من نیم ئامۆژگاری بنووسمەوە بەڵکو ئەوە ئامۆژگاری بوو منی نووسیەوە ، هەربۆیە من باوەڕم بە کات هەیە بەڵام بە کاتژمێر نا .

١١١١. لە کۆتایش دا دوو ئامۆژگاری گرینگی جەنابت دەکەم :-

یەکەم : هەموو شتێك بەکەس مەڵێ کە دەیزانی .

دووەم : ................................................ !!!

**ئەو کەسە ســەرکردەی راستەقینەیە کە بتوانی سەرکردایەتی نەفسی خۆی بکات پێش خەڵکان وە کــۆنترۆڵی عەقلەکان بکات پێش جەســتەکـــان .**



**دڵنیابە بەختەوەری بەدزیەوە لەو دەرگایە دێتە ژوور کە نەتدەزانی بە کراوەیی جێت هێشتووە ، بۆیە سەرکەوتن کلیلی بەختەوەری نیە بەڵکو بەختەوەری کلیلی سەرکەوتنە .**



**ئەگەر خودا تەمەنی پێ دایت و نەوەکانی خۆت بینی پێیان بڵێ رۆڵەکانم هەر کەسێك لە تەمەنی پاش داهێنان و سەرکەوتن بژی ئەوا تامی ڕاستەقینەی ژیانی وون کردووە .**



ئەگەر ئامانجی هەژارێك و دەوڵەمەندێك پارە بێت جیاوازیان چیە ؟ جیاوازی بیرکردنەوەیان ئامانجیان دوور و نزیك دەكات ، هەژاران ئارەزوو دەكەن پارە بەدەست بێنن کەچی دەوڵەمەندەکان باوەڕیان وایە کە بە دەستي دێنن .



**بەپێی ئەزموونی کەسانی ژیر لە ژیاندا تەنها دوو ڕێگە هەیە بۆ سەرکەوتن ﴿ یەکەم : ئەوەیە هەرگیز خۆت بەدەستەوە نەدەیت ، دووەمیش : ئەوەیە کە سوربیت لەسەر ڕێگای یەکەم ﴾ .**



**سەیرکردنی فلیمە کۆمیدیە کۆنەکان مانای کۆمیدیا ناگەینێت بەڵکو مانا ڕاستەقینەکەی ئەوەیە کە ئێمەی مردووی بەناو زیندوو بە مردووەکان پێ دەکەنین کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا تراژیدیایە نەك کۆمیدیا .**



## لە فرۆکەخانەی ژیان :-

**هەمووومان بە پلیتي گەڕانەوە هاتووینەتە نێو ئەم دونیایە وە بەرواری گەڕانەوەشمان لەسەر پلیتەکە نووسراوە ، بەڵام بەداخەوە کە نەخوێنەوارین .**



**نەك جارێك سەدان جار بیرکەوە لە دونیا شتێك بڵێ و بنووسە کە لە قیامەتدا جورئەتی ووتنەوەی و خوێندنەوەیت هەبێت ، بۆیە ئەلێم : خوداکەم ئەوکات تۆ دەناسم کە زانیم ناتوانم بتناسم ...**



# سـ ـــــــــەرەتـــا !!!

سوپاس بۆ خودای مەزن و میهرەبان ...

**خوێنەری بەرێز سەرەتا و کۆتای ئەم کتێبەی نێو دەستت جیاوازە لەو کتێبانەی پێشتر خوێندووتەوە ، سەرەتای ئەم کتێبەمان کرد بە کۆتایی هەروەك کۆتاییەکەشی بووە بە سەرەتا ، تاکو خوێنەر لە کاتی کۆتایی پێهێنانی کتێبەکە بڕیاری سەرەتایەکی نوێ بدات لە خوێندنەوەو گەڕان بەدوای وتەی ناوداران و کەسانی ژیرو شارەزاو بە ئەزمـوون بەجۆرێك وتەکانیان لە ئەنجامی بەخشینی بەبەهاترین سەرمایەی ژیانیان کە تەمەنیانە بەدەست هێناوە ، تاوەکو چیتر هەڵەکانی یەکتر دووبارە نەکەینەوەو سوود لە سەرکەوتنەکانی یەکتر وەربگرین ، بەم جۆرە دەتوانرێ زیاتر سوود لە خوێندنەوەی تاکە تاکەی ئامۆژگاریەکان وەرگیرێت ، واتە ئەو کۆتاییە ببێت بە سەرەتا و دەسپێکی بڕیارێکی مەزن بە ئەندازەیەك کۆتایی هەموو کتێبێك سەرەتای خوێندنەوەو موتاڵای کتێبێکی تر بەدوای خۆیدا بهێنێت ، خوێندنەوە لەلای گەلانی پێشکەوتووی دونیا و بووە بە کەلتورو نووسەرو زاناو پیتۆڵ و خاوەن ئەزموونەکانیان بەوپەڕی دڵسۆزی و لێبڕانەوە بۆیان دەنووسن و ئەزموونی ژیانیان دەستاو دەست بۆ دەگوازنەوەو ئەوانیش بەوپەڕی پێزانین و سەلیقەوە کاتەجوانەکانی خۆیان بۆ خوێندنەوەی شاکارەکانیان تەرخان دەکەن ، بەو هیوایەی ئێمەش بتوانین سوود لە وشە جوانەکانی ژیان وەربگرین پێش ئەوەی بپرسین کێ وای گوت و لەکوێ وای گوت یان چ ڕەنگ و دەنگ و ئینتیمایەکی هەیە ، چونکە ڕاستی هەر ڕاستی یە وتەی جوانیش هەر جوانە جا هەرکەسێ وتبێتی .**

**بۆیە لەم ساتەوە هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەکتان بۆ دەخوازم ...**



Omer Chooser

- چۆن زانا لە نەزان جیادەکەیتەوە ؟ هەموو زانایەك ئەزانێ کە نەزانە بەڵام نەزان وا ئەزانێ زانایە ، هەرکات زانا هەستی کرد زانایە ئەوکات نەزانە ، وە ئەگەر نەزان هۆی نەزانینی خۆی زانیبا بەدڵنیاییەوە دەبوو بە زانا ، ئەو زانستەی کە زانا دەیزانێت دڵۆپێکە و ئەوەی نایزانێت ئۆقیانۆسێکە چونکە دوو جۆرە کەس کۆمەڵگا لەناو دەبەن یەکێکیان نەزانێت و قسەبکات ئەویتریش بزانێت و قسە نەکات ، وە هەرکات لەگەڵ زانایەك قسەت کرد بە ژیرانە قسە بکە بەڵام ئەگەر لەگەڵ نەزانێك قسەت کرد بە ژیرانە بێ دەنگ بە ، دەڵێن هەموو کەم زانێك نەزانە بەڵام مەرج نیە هەموو زۆر زانێك زانابێت ، وە هەرکەس هەست بە نەزانینی خۆی بکات لە هەموو کەس زاناترە بۆیە زانا بە مردوویش هەر زیندووە بەڵام نەزان بە زیندوویش هەر مردووە .

- هەوڵدە ئادەمیزاد بیت نەك مرۆڤ چونکە ئەوەی رێزی لێگیراوە ئادەمیزادە نەك مرۆڤ .

- جیاوازی نێوان ئێمە و وولاتانی پێشکەوتوو ئەوەیە کە ئێمە دژایەتی زیرەکەکان دەکەین تا شێت دەبن ، ئەوانیش یارمەتی شێتەکان دەدەن تاکو چاك دەبن .

- هەڵەی دکتۆر مرۆڤ لە ژێر خاك دەنێت ، وە هەڵەی ئەندازیار خاك بەسەر مرۆڤ دەنێت ، بەڵام هەڵەی مامۆستایەك نەوەیەك بە زیندوویی جینۆساید دەکات .

- ئەگەر من توانیبم شتێك لە دووری ببینم بە شێوەیەك کەسانی دەوروبەرم نەتوانێ بیبینێت ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە من لەسەر شانی پیاوانی مەزنی رابردوو وەستاوم بۆ ئەوەی رێگای دووری داهاتووم زیاتر رۆشنتر ببینم ، بۆیە سوپاسیان دەکەم .








لا يتواضع إلا من كان واثقاً بنفسه
ولا يتكبر إلا من كان واثقاً بنقصه

نرخ ( ٣٥٠٠ ) دینار